PDF 4 KURD



نووسینی
هانز خافێ

# جیهانی ئیمپریشێنیزم

## ئەو هونەرمەندانەی لە بەختەوەرییەکانی ژیانەوە نیگارکێشیان کردووە

وەرگێڕانی

لە ئەڵمانییەوە: ئیسماعیل حەمە ئەمین
لە هۆڵەندییەوە: حەمەی ئەحمەد ڕەسووڵ

سلێمانی ٢٠٠٣

PDF 4 KURD



## ڕوانینێکی نوێ بۆ ڕیاڵ

لە پێناوی تەماشاکردنی تابلۆ ناوازەکان، خەڵکی بە وروژم و تاسەیەکی زۆرەوە خۆیان کرد بەو پێشانگایەی لە پازدەی ئاپریل هەتاوەکو پازدەی مای هەزار و هەشت سەدو حەفتاو چوار کە لە یەکێ لە ستۆدیۆکانی پاریس کرابۆوە. لەم پێشانگایەدا زۆر لە تابلۆسازانی وەکو مۆنێ، سیسلی، ڕێنوار و پیسارۆ و بێرتە مۆریزۆ و دێگاس بەشداریان تێدا کردبوو، سەرەڕای بەشداریکردنی ڕیزێکی دیکەی تابلۆسازان، کە زۆر لەو نێوەندە نەناسرابوون.

ئەم پێشانگایە بە یەکەم هەنگاوی گروپە هونەرمەندێکی تابلۆساز دەناسرێ لەژێر ناونیشانی (کۆمەڵگەیەکی نادیاری -ئەنۆنوم- هونەرمەندە نیگارکێش و گرافیکارو پەیکەرتاشەکان) Societe anonyme des artistes

(Peinters teus et graveurs p scul) خۆیان نێوزەد کردبوو، ئەمانە دەیانویست نوێبونەوەیەك بهێننە بـواری نیگارکێشـانەوە، بـەم هەنگاوەشـیان زۆر خـەڵکیان لـەخۆ کۆکـردەوە. ڕاسـتی خـەڵکان بـە چەندەها شێوەی جیاواز، بە هەستێکی پڕ گاڵتەو ڕەخنـەوە لـەم ئەزمونـەیان دەڕوانـی، ئـەوان نەهاتبوون بۆ ئـەوەی بـە تابلۆکـان سـەرمەد بـن، بەڵکو هاتبوون بۆ گتاڵتەجاڕی کردن بەو هەموو پەڵەو پرژە ڕەنگاڵەی بۆیەو لادانی ئەو گروپە لە بنچینـە باوەکـانی وێنەکێشـانی بـاوی ئـەو سەردەمە.

نێونیشـانی تابلۆیـەکی کلـۆد مۆنـێ- لـە خۆرهـەڵاتن ڕوانـین (Impression, soleil levant) کاریگەرییەکی سەیری کردە سەر (لویس لۆری) کە وەکو ڕەخنـەگرێك بـۆ گۆڤـارێکی ڕەخنـە Le Charivarie گاڵتـەئامێز کـاری دەکـرد، ئـەو بـە گاڵتەجاڕییەوە ئەم گروپە هونەرمەندەی بەنێوی -ئیمپریشیۆنیستەکان- ئینتباعیەکان- نێـوزەد کرد، لە جیاتی ئەوەی هونەرمەندەکان هەست بە بێوازیـی بکـەن، ئـەو گاڵتەپێکردنـەیان وەکـو

PDF 4 KURD



کاریگەرییەك بۆ سەر لویس لۆری لێکدایەوەو بە گرنگی پێدانەوە ئەو ناوەیان وەرگرت، ئەو ناوەیان وەك نێونانێك قبوڵکرد کە بەکاری نوێ لەسەر خامی سپی و ڕەنگ بەکارهێنانی تایبەت جودایان دەکاتەوە لە هونەرمەندە باوەکانی سەردەمی خۆیان، بەم شێوەیە نێوی (ئیمپریشیۆنیزم/ ئینتیباعی) وەك نێو و چەمکێکی هونەری خۆی کۆرپەیی کرد، بەوەی نوێنەری شێوازێکی نوێیە لە هونەری تابلۆسازی و نیگارکێشاندا.

ئیمپریشیۆنیستەکان تەنها لە بەهاری ١٨٧٤ سەیارن هەڵنەدا، بەڵکو زۆر پێش ئەوەش وەك کۆمەڵێ هونەرمەندی شارەزا کاری خۆیان نیشاندابوو، بزووتنەوەی ئەوان لە پێشانگای جیهانی ١٨٥٥ لە پاریس سەرەتای خۆی دەستپێکردبوو، ئەو کاتە سالۆنی "Salon" پاریس شوێنێکی ڕەسمی بوو بۆ کاری هونەری، بۆ هونەرمەندانیش وەك بازدانێك بوو بۆ نێو دانپێدان و خۆناساندنیان بە جەماوەر، دۆخ و جەماوەری تەقلیدی زاڵبوو بەسەر پێشانگاکانی

سالۆندا، لەم کەشە هونەرییەدا تابلۆ بوێرەکانی گوستاف کۆربێ –Courbet Gustav جێی ڕەتکردنەوەو ناوازەکردن بوون، کۆربێ لەو پێشانگایەدا دەوارێکی تایبەت بە خۆی دامەزراندبوو، ئەو ستایلەکەی نێونابوو –دەواری ڕیالیزمی Pavillon des Realismus، ڕیالزمێك بە تەواوەتی لە بابەتی ئیدیالی هونەری تابلۆی کلاسیك جودایە، پێچەوانەی هەستە نەرمە ڕژاوەکانی قوتابخانەی کلاسیك، پێچەوانەی ئەو ئەندێشە پڕهەستانەی ڕۆمانسیەتەیە، کە لە نمونەی تابلۆکانی –دێلاکروا Delacroix– بە جوانی خۆی ئاوێنەییکردووە.

کۆربێ دەیوویست ڕیالیستی لە بەرامبەر ئەو هونەرەدا زەقکاتەوە، کە زێدەتر لە سالۆنی پاریسدا لە (گێڕانەوەی چیرۆك) دەچوو وەك لە (هونەری ڕاستەقینە)، ئەو بەو ڕیالیزمیەوە دەیویست کۆتایی بەو حیکایەتۆکانە بهێنێت کە لەو سەردەمەدا بابەتی تابلۆکانی کلاسیکی داگیرکردبوو.

PDF 4 KURD



بەڵام نەوەیەکی گەنجتر لە کۆربێ وەکو ئیدوارد مانێ Edouard Manet بە هەنگاوی چالاکترەوە دەچوونە پێشێ، مانێ دەیگوت (چاو و دەست) و ڕەخنەشی لە هەموو ئەوانە دەگرت دژی ئەو پەیوەندیە ڕاستەوخۆیەی نێوان دەست و چاون، دەست پێویستە درێژبوونەوەی چاوبێت نەك بیرکردنەوە، دەبێت بینراو بکاتە دەربڕین نەك بیرلێکراوە. بەم ڕوانینەوە مانێ چەمکی هاوچەرخی (Contemporantite) لەگەڵ خۆ هێنا، کە تێگەیشتنێکی هاوچەرخ بوو لەمەڕ هونەر، ئەم فۆرمالیزە هاوچەرخەی هونەر، بزووتنەوەی ئیمپریشینستەکانی بەرەو پێشەوە برد.

ڕێگە درێژبوونەوە لە ماشێنسازیەوە تاوەکو دوا بابەتی کار لەسەرکراوی میتۆدگەران لە تەکنیکی کارکردندا لەسەر خامی سپی، شێوازی کارکردنی گروپە یاوەکو تاکی ئەم ڕێبازە هونەریە نەبوو، ئەمانە هەمووی لە هەوادا دەسوڕانەوە.

ڕاستی نێزیکەی سی ساڵ لەوەو بەر شاعیری هەست ناسکی ڕۆمانسی چارلس بۆدلێر Charles Baudelaire هەموو تیۆریزەکانی ئەم ڕێبازەی لە

PDF 4 KURD



وشەکانیدا گرێچن کردبوو، دوای چەند عەیامێك ئەو وشانە لەلایەن ئیمپریشینستەکانەوە ڕیالیزە کرا.

ئەم شاعیرە لە ساڵی ١٨٤٥دا ڕاپۆرتێکی لەسەر (ساڵۆن)ی پاریس نووسی، تێدا نووسیبووی (وێنەکێشی ڕاستەقینە، ئەو هونەمەندەیە دەتوانێت ئێستای پاڵەوان لە جلوبەرگ ڕووتبکاتەوە، لەڕێی هێڵکارییەکانیەوە بە نیگار تێماندەگەیەنێ و فێرمان دەکات، چەندە پێڵاوەکانمان بریقەدارن، چەندە بۆینباغەکانیشمان مەزن و شاعیرین).

دوای چەند ساڵێکی دیکە هەمان شاعیر لە نووسینێکیدا گووتی (هونەرمەندی ڕەنگ مەزن ئەو هونەرمەندەیە ڕەنگ لە پاڵتۆیەکی ڕەشەوە نیشاندەدات، ڕەنگ لەسەر بۆینباغێکی سپی و پشتوێنەیەکی خۆڵەمێشی نیشاندەدات.. ژیانی پاریسی پڕێتی لە بابەتی شیعری لەسەرسوڕمان و جوانیدا لە زۆر شت نێزیکمان دەکاتەوە، زۆر شتی وەکو هەوا، ئەو هەوایەی لەگەڵماندا دەژی و نایبینین.

PDF 4 KURD



مانێ پێش هەمووان گەیشتە ئەو جوانیەی بەردەوام لەگەڵماندا دەژی و هەستی پێناکەین، ئەو هونەرمەندێك بوو ئەو جوانیەی ناسی و توانی لە ڕەنگی ڕەشەوە ڕەنگی دیکەمان نیشاندات، توانی ئەتمۆسفێرێکی جوانیی لە ڕێگەی چاوەوە پێشکەش بکات. بە هەمان ئاست هەموو نوێخوازییەکی ئیمپریشینستەکان، کاریگەریەکی گەورەو نەرمونیانی شێوە نوێیەکانی کارکردن بوو لەسەر خامی سپی).

دیارە کاریگەری وشەکانی بۆدلێر، کردنی ئەو وشانە بە ریالێك لەسەر خامی سپی، ڕەنگدانەوەیەکی سروشت بوو لەسەر سکێچ و کاری خامی سپی، کە بۆدلێر بە هەڵچونەوە پێشوازی لێدەکرد، لەو کاتەدا بۆدلێر لەمەڕ کارەکانی هونەرمەندێکی سروشت و هێڵکارێکی وەك یۆجین بۆدان EugoneBouden نووسی و تابلۆو سکێچەکانی بەم شێوەیە وەسفکرد (ئەو کارە پڕ کاریگەرییە قووڵانە، ئەم لێکۆڵینەوانە نیشاندانی ڕاستەقینەیی سروشتە، زۆر بە خێرایی فانی بوون لە فۆرمی ڕەنگەکانەوە خۆی

PDF 4 KURD



دەنوێنــێ، شــەپۆل و هــەورەکان وەك ئــەوەی بــە نەبینراوی بوونیـان لـە لێـوار تابلۆکـەدا شـێوەیی بکـەن ئـاوا لــە ڕێگــەی نووســینی ڕۆژو کــات و ڕێڕەوی ڕەشەباوە ئەو نەبینراویە درێژدەکەنەوە، بــۆ نمونــە لــە ســوچی تابلۆیــەکدا نوســراوە: نیوەڕۆی هەشتی ئۆکتۆبەر، با لە بەشی باکوری ڕۆژهەڵاتەوە هەڵدەکات).

وشـەکانی بۆدلێر وەکـو وشـەی پەیامبـەرێتی وابــوو بــۆ ئیمپریشینســتەکان، ئــەو وشــانە بــە تــــــەواوی ئــــــەرك و شــــــێوەکارکردنی ئیمپریشنیســتەکانی وەســفدەکرد، وەســفی ئــەو ڕوانینـە ساتەوەختە ڕاکـردووەی ئـەوانی دەکـرد، لـێرەوە خـاڵی بڕیـاردانی ڕوانینیـان بـۆ شـتەکان خــۆی کۆرپــەیی کــرد: چونکــە ئــەوان نیــەتیان کارکردن لەسەر شێوەکانی تـەکنیکی وێنەکێشـان نـەبوو، هـەروەها مەبەسـتیشـیان ڕێکخسـتنەوەی نوێی نێوەڕۆکی بابەتی تابلۆکان نەبوو، زۆر لـەوە دورتر، ئەوان دەیانوویست لە ڕێگەی تەکنیکەوە کاربکـەن بـۆ پێکـهێنانی شـارەزایەکی نـوێ، بـۆ ئەوەی دەربڕینی ڕوانینێکی‌نوێی دنیای ڕیاڵ بن.

لەوانەیە یەکەم پرسیار ئەوە بێت کە سیفەتە دیارەکانی ئەم ڕێبازە چیە؟، پێش هەموو شتێك دەبێت ئەوە بزانین زۆر بابەتی ورووژێنەر لەم بوارەدا ئامادەیی لە شێوە باوەکانی ئەم وێنەکێشانەدا هەیە، لە هەموویان بەرچاوتر ئەوەیە، کە هەموو بینراوێك دەتوانرێ ببێت بە بابەتی تابلۆیەك.

هونەرمەندەکان لە ڕێگەی شێوە کارکردن و چارەسەرکردنی بابەتی تابلۆکانیان، بیروڕاکانی خۆیان دەردەبڕی، ئەوان چیدی لەبارەی بابەت (ئۆبێکت–Obejekt)وە قسانیان نەدەکرد، بەڵکو لەمەڕ (مۆتیڤ–Motiv)ە پاڵپێوەنەرەکان دەدوان. مۆتیڤێك سەرەتا بە ئسلوبێکی نادیار دەجوڵێ و لە کاتی کارکردندا شێوەکانی خۆی دیاریدەکات. مۆتیڤی سەرەکی ئیمپریشینستەکان دیمەنی سروشتی بوو، ئەو دیمەنە سروشتیەی بە سێبەری تەنکی ڕەنگ و ڕوناکی خۆی دەنەخشاند، بەم شێوەیە دیمەنی جوانی سروشت شێوەیەکی وێنەکردنی تایبەتی لە تابلۆدا لەخۆگرت، هەروەکو

PDF 4 KURD



چۆن شاریش وەك بابەتی تابلۆ هەمان شێوە نیگاری بەخۆوە دی، ئیدی لە جیاتی درەختە ڕازاوەکان، ڕەنگی شاڵ و چەترە ڕەنگاوڕەنگ و پەڕۆ شەکاوەکانی بەر ڕەشەبا هاتنە نێو بابەتی شارەوە، کەمێك دوور لە هەڵمی شارە مەزنەکان و دوور لە دەوروبەری پاریس و بە درێژایی ناوچە دەستلێنەدراوەکانی، هونەرمەندەکان دیمەنەکانی خۆیان دۆزیەوە، بۆ ئەم مەبەستەش کارێکی گران نەبوو بۆیان بە شەمەندەفەر هەموو پێداویستیەکانی نیگارکێشان لە ستۆدیۆکانیانەوە لەگەڵ خۆدا بهێنن و لەبەرامبەر زەوی‌و ئاسمانی سەربەستدا دایانەزرێنن.

چێژو خۆشبەختی لە کاتی نیگارکێشان لە سروشتێکی سەربەستدا، یەکەم نوێخوازی ئەوان بوو، چێژێك بە هەمان ڕێچکەی (ریالیزم)ی کۆربێدا هەنگاوی دەنا، هەرچەندە لەم ڕووەوە جوداوازیەك هەیە، کۆربێ لە ستۆدیۆکەی خۆی دیمەنەکانی دەنەخشاند و مۆدێلی بەکاردەهێنا، کەچی نیگارکێشە لاوەکان وەکی مۆنێ، بە

PDF 4 KURD



هەڵچوون و سەرفرازیەوە لە سروشتی سەربەستدا کاری خۆیان دەکرد.

ئەوان درێژبوونەوەیەك بوون بەرەو ریالێتێت. ریالێکی بێرتوش و دەسکاری، راوکراو و نیگارکێشراو، بە مانای روانینی هونەرمەندەکان نەدەتوانرا بەبێ شێوازێکی جێگیریی لەکارکردن و ئازارێکی گەورە سەیربکرێت، بکاری ئەمان پری بوو لە نێرڤوسیەتێکی هەستیاری زاخاودارو بەتواناکانی ژیان، ژیانێکی زاڵبووی پڕاوپڕی ئەو روانینە، کە هێزێکی شۆڕشگێری و نوێخوازی بە دیدی هونەریان بەخشی.

نیگارکێشی ئیمپریشینستی نەدەهات لە بابەتێ بروانێ و لە دواییدا لە گەڵەریە تایبەتەکەی خۆیدا کاری لەسەر بکات، ئەوان بڕوایان بە چاو و خێرایی شتەکان و ڕاوکردنی ئەو بابەتە یان ئەو دیمەنە بوو لە ساتەوەختی خۆیدا، لەبەردەم دیمەنەکە کارکردن بە هەموو دووریەکانیەوە خۆی ئامادە دەکرد، لە هەمووشی گرنگتر بە لایانەوە رووناکی بوو، ڕوناکی پەخشبوو بەسەر درەختە مەزنەکان، ڕوناکی

PDF 4 KURD



شـكاوەی نێـو ئـاو، ڕونـاكی پەرشـبۆوە بەسـەر گۆمیلكە نازەنینەكان، ڕوناكی خلیسـكاو بەسـەر جلوبەرگــەكاندا، تەنانــەت پیاســەكردنەكانی بــەهارانیش ڕونــاكی خــۆی هــەبوو، ڕونــاكی پێچەوانـەبووی سـەر توێژاڵـی ئـاوی وەسـتاوی دەرچایـەكان، كـە ڕەنگـەكانی دەریاچـەیان لـە دووتوێی سێبەرەكانیەوە دەبریسكانەوە، ئەمانەو زۆر دۆزینــەوەی جوانــی شــتەكان لەلایــەن ئیمپریشینســـتەكان لـــە تابلۆكانیـــاندا ڕەنگیدەدایەوە، گەر تەماشاكەری ئـەو تابلۆیانەی نەهەژاندایە ئـەوا بێگومان لەسەرسـوڕماندا جێـی دەهێشـت، سەرسـوڕمانێك بەرامبـەر ڕەنـگ و ڕوناكی دنیای بینراو.

كۆربــێ كاریگەرییــەكی مــەزنی ڕپمانــای بڕیاردەری هـەبوو لەسـەر پەرەسـەندنی هونـەری نیگاركێشـانی سـەدەی نۆزدەهــەمدا، كۆربــێ و هاوەڵــەكانی چــاودێری بینراویــان، بینــایی ڕاستیەكانیان وەك بوونێكی ڕیاڵ و وەك خاڵێكی یەكبوون دەكرد، بەم شـێوەیە كاریگـەری بینـراوی دیمەنـەكان جێـی حـەزو سەرنجڕاكێشـانی ئـەوان

PDF 4 KURD



بوو، لەبەر هەمان هۆکار بوو ئەوان وازیان لە هەموو بابەتێکی ئەدەبی و میتۆلۆژی و چیرۆك گێڕانەوە هێنا، خۆیان لەنێو هەموو دیمەنێکی بینراو و هۆشمەندیدا نەفیکرد، لەنێو ڕاستەقینیەتدا تابلۆیان دەبینیەوە. هەموو شتێکیش بەدەر لە ڕاستەقینەیی و هەستکاری لای ئەوان جێی ڕەتکردنەوە بوو، ئیدی ئەوان لەوە زیادەتر هەنگاویان نەدەنا، لەوەندە زیاتر، ئەوان لەنێو دەرئەنجامەکانی هەست و بینراوی ڕاستەقینەدا هاوژین و کارابن هەنگاویان نەدەنا.

هەموو شتێك دوور بێت لە بابەت و بینراو بەچاو، دوور بووە لە مەملەکەتی ئیمپریشینستی، لە هیچ زەمەنێکدا هونەری نیگارکێشی ئەوەندە کاری لەسەر چاووڕوانین نەکردووە، جارێکیان مۆنێ Monet گووتی: من حەزم دەکرد بە کوێری لەدایکبوومایەو لە پڕێکدا ڕۆشنایی چاوم بۆ بگەڕایەتەوە، تەنها بۆ ئەوەی بتوانم شتەکان بێکاریگەری پێشینەیان، وەك خۆی ببینم.

مۆنێ تاکەکەس نەبوو ئەو ئاواتەخوازیەی هەبێت، لە Element of Darwing توخمەکانی

PDF 4 KURD



نیگـارە شوشـەییەکان دا ڕەخنـەگری ئینگلـیزی یۆهـان ڕۆسـکین Ruskin Johan لــە ١٨٥٧ دا نووسـی: [دەرکپێکردنـی فۆرمەکـان کارێکـە لـە شارەزاییەوە پێکدێت. چونکە ئێمە تەنها ڕەنگـە ماتەکان دەبینین، کاڵبوونەوەی ڕەنگەکان دەبینین و لـە ڕێگـەی چـەند هەوڵدانێکـەوە ئـەوەمان بـۆ دەردەکـەوێت، کـە لـە پەڵەیـەکی ڕەش یـاخود خۆڵەمێشی، جەوهەری Substanz تاریکی بەشێك نیشـان دراوە، یـاخود لاوازی ڕەنگێـك مانـای دووریـەکی تایبەتـە لـە تابلۆکـەدا، بـەم پێیـەش دەتوانرێ هەموو تەکنیکی نیگارکێشان لە چەند وشـەیەکدا کۆبکرێتـەوە کـە ئـەویش (بێتـاوانی چـاو)ە، بـە مانـای بـە ڕوانینـی منداڵانـەوە ڕاستەقینەیی ڕەنگـە کاڵـەکان وەرگریـن، نـەك لـە ڕوانگەی هۆشمەندی شتەکانەوە شتەکان نیشان دەین، وەك کوێرێك لەپڕدا بینایی بۆ گەڕابێتەوە].

بـەم شـێوەیە بێتـاوانی بینـایی و چـاو خـاڵی قوتاربوونی مۆنێ و هاوەڵەکانی بوو، ئەوانەی لەو ڕێبازەوە توانیان بە دڵسۆزی و ڕاسـتەقینەییەوە جیـهانی ڕاسـتەقینەی هـەبووی بیـنراو

نیگارکێشــەکەن. خــاتوونی نیگــارکێش بێرتــێ مۆریـزۆ Berthe Moresot جارێکیـان گوتـی: کاتـێ سەیری تابلۆیەکی مۆنێ دەکەم بە تەواوی دەزانم، لـە چ شـوێنێکدا ئــەو چــەتری خۆرەکــەی ڕاگـیر کردوە.

PDF 4 KURD

PDF 4 KURD



## تەکنیکی ئیمپریشێنیزمەکان

ئەم تەکنیکە دەرئەنجامی ڕوانینێکی نوێ بوو بۆ ڕیالّ، بۆ دنیای ڕاستەقینە، وشەی ڕوانین تەنها وەك ئەبستراکێك مامەڵەی لەگەڵدا نەکرابوو، بەڵکو بۆ یەکەم جار بوو ئاوەها پڕبەپڕی وشەو مانا فراوانەکانی مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ. دنیای ڕاستەقینە لای ئیمپریشیۆنیستەکان ڕووبەری ڕەنگە مات و بریقەنەدارو ناتیژەکانە، لەمبارەیەوە ڕوسکین نووسیویەتی و دەڵێت:

ئێمە شتەکان لە فۆرمی هۆش و ئەقڵی پێوانە کاری خاڵکێشان و پلە بەرزبوونەوەکانی ڕوناکی و سێبەرەکانەوە نابینین، بەڵکو شتەکان لە ڕێگەی چەند خاڵێکی ڕەنگاوڕەنگ دەبینین. چەند خاڵێکی ڕەنگاوڕەنگ خۆیان لەبەر چاوماندا زەقدەکەنەوەو بە ڕاستەوخۆیی دەیانبینین.

PDF 4 KURD



ئیمپریشیۆنیستەکان ئەو خاڵە ڕەنگاوڕەنگانەیان لە ڕێگەی ژمارەیەکی زۆر کورت کورتی فڵچەوەشاندن و ڕووبەری ڕەنگەوە نیشان دەدا. لەم شێوازەوە تابلۆیەك ئافەریدە دەبوو، ڕاستەقینەیی چاوی جارێکی دیکە نیشان دەدایەوە، ئەمە تەکنیکێك بوو پێچەوانەی ئەو تەکنیکە بوو کە تابلۆ لە ڕێگەی زانینی هزری خۆمان و خودڕەوابوونی خۆمان و بیرکردنەوەی خۆمان نیگارکێش بکەین و نیشانی بدەین. دیارە بۆ ئەوەی لە تابلۆیەکی ئیمپریشیونیستی تێبگەین، نابێت هیچ بابەت و وێنەیەکی خودی نێو هزری خۆمان بێنینە بەرچاو و تابلۆکەی پێ ڕاڤە بکەین، نەخێر، بەڵکو دەبێت بە ئاسانی واز لە تابلۆکە بێنین وەك بەشێك لە سروشت کاریگەری خۆی لەسەر بینین و چاوەکانمان جێبێڵێت.

لەم پرۆسێسەدا هونەرمەند زیاتر گرنگی داوە بە جووڵەو کاریگەریەکانی چاو وەك لەوەی گرنگی بدات بە شتەکە خۆی، لێرەوە دەتوانین ئاوەها سەیری ئەم شێوازی کارکردنە بکەین، کە

شێوازێکی نیشاندانی شتەکانە بە شێوەیەکی زۆر ڕوون. مرۆ هەست بەو مانا قووڵانەی پەڵە ڕەنگاوڕەنگەکان دەکات کە لەژێر نەزمی زیندوێتی فڵچە وەشاندندا خۆی ڕاستەقینەیی کردووە.

تەکنیکی ئیمپریشیۆنیستەکان بەرەو نوێبوونەوەیەکی دیکەی هەنگاوی نا، ئەویش ئەو نوێخوازیە بوو کە ڕاستەوخۆ لە هەڵگرتنی ڕەنگەکانی سەرپالێتەکەیان بۆ سەر خامی سپی ڕەنگی دایەوە، ئەوان تێکەڵ و پێکەڵی ڕەنگەکانی سەر پالێتەکانیان گواستەوە بۆ نێو تابلۆکانیان، خۆ گەر مرۆ لە دوورییەکی پێویستەوە سەیری تابلۆیەکی لەوجۆرە بکات وا هەستدەکات سەیری چنینێك یاخود پارچە مۆزایکێك دەکات. بەڵام گەر وردتر لەو جۆرە تابلۆیە بڕوانرێت هەستدەکرێت بەوەی کە ڕەنگەکان تێکەڵ نەبوون بەڵکو لە پەنا یەکتریەوە خۆیان نیگارکێش کردووە، ڕەنگەکان ئاگرینی و بڵێسەیی خۆیان هەیە، ئەمانە هەمووی ئاماژە بوون بۆ ئاستی تۆنە جیاوازەکانی ڕەنگەکان.

PDF 4 KURD



له خاڵ و پنت و خۆرو سروشتی کراوه جێگەی ستۆدیۆ نیمچه تاریکەکانی نیگارکێشانیان گرتەوه، نەك ئەوەندە تەنانەت بریقەدانەوەی خامی سپی تابلۆکانیش لەم تەکنیکە نوێیەدا، وەك مامەڵەکردنێکی جیاواز لەگەڵ خامی سپی هەستی پێدەکرا.

ئیدی (بێتاوانی چاو) له تەکنیکی نوێی ئیمپریشیۆنیستەکاندا دەربڕینێکی زیندەگیانەی پێوانەکاری خۆی هەبوو، بێتاوانی چاو پڕبەپڕی وشەو بە ڕاستەقینەیی پراکتیزه کرد. ئەم پێچەوانەکردنەوەی ڕاستەوخۆی بینراوە ڕێگەی لە هەموو تەفسیرێکی جیاواز گرت، تاکه تەفسیر بۆ ئەم کارە نوێیانە ئەوە بوو کە ڕستەی (دەست درێژ بوونەوەی چاوه) بووه ڕاستیەکی بینراو و بەڵگەنەویست.

له سەروو هەموو ئەمانەشەوە ئەم تەکنیکە نوێیە وەك کارێکی سکێچکاری دەبینرا، هەر هەمان هۆکار بوو وای کردبوو کە زۆربەی قوتابخانە ترادیسۆنەکانی نیگارکێشانی ئەو سەردەمەو قوتابییەکانیان، کاری

PDF 4 KURD



ئیمپریشیۆنیستەکانیان بە (کاری ناتەواو) دەستنیشان بکەن. لەمبارەیەوە بۆدلێر زۆر بە جوانی جیاوازی کردووە لە نێوان تابلۆیەکی تەواوکراو و تابلۆیەك کە هەمیشە کاری لەسەر دەکرێت، تابلۆیەك لە زمانی بۆدلێر (تا مردن نیگارکێشی تێدا دەکرێت).

بۆدلێر توانی سەرنجی نێوەندەکانی نیگارکێشان بۆ مانای -ئیلهام- ڕاکێشێ، ئەو ئیلهامەی کە ئیمپریشیۆنیستەکان زۆر بە کارامەییەوە توانیبوویان بەرجەستەی بکەن. بەرجەستەکردنی هەلاوی ناڕاستەوخۆی بینراوێکی لەپڕ کە تابلۆ دەپارێزێ لە هەستی خنکاندن لەنێو ڕۆتیندا.

تابلۆی ئیمپریشینستی، تابلۆیەکە بە مەبەستەوە لە سترۆکتۆرێکی بەش بەشی پێکهاتووەو هەرواش ماوەتەوە. لەم شێوازەوە (مەبەستی لە شێوازی بەش بەشکردنە. و. ئیسماعیل) دەتوانرێ ناڕاستەوخۆیی تابلۆ بپارێزێ، بەلام لە هەمانکاتدا هەولی خۆدرێژکردنەوەی پرۆسێسی بینین نادات بەرەو

PDF 4 KURD



بەشــە کورتکـــراوە جێگـــیرو ڕاوەســـتاوەکانی ڕاستیەکان، پرۆسەی بینینیش لەسەر ئەو ئاستە سـکونیانە کـورت ناکاتــەوە، بــەڵام ئــەوەی لــەو پرۆسێســە دەمێنێتــەوە ئـەو سـەرەتایانەیە کــە بینراوەکەی لێهەڵقولاوە.

بەم شێوەیە شاکاری ئیمپریشیۆنیستەکان بە مەبەستەوە کارێکی بەشخواز بوو، ئەوان بەوپەڕی ئیرادەو مەبەستەوە تەنها بەشێکی دنیای ڕیاڵیان نیگـــار دەکێشـــا. هونەرمـــەند لـــەو شـــێوازەدا مەبەســتی بــوو تەنــها بەشــێك، پارچەیــەك لــە سرووشـت بكێشـێت، بەشـێك كـە نمونەیەكـە لـە جیـهانێکی پـڕ لـە موجیزە و پـەرجوو. هـەروەها هەڵـەی سـنووردارکردنی تابلۆکـانیش خـۆی لـە خۆیدا بەشێك بوون لە کاراکتـەری ئەو تابلۆیانـە: بینـەر دەبێت خاوەنی ئەو هەستمەندیە بێـت کـە بتوانـێ سـنووڕپەڕی نێوەڕۆکی تابلۆکـە بێـت کـە بـەرەو دەرەوەی چوارچێوەی تابلۆکە خـۆی درێـژ دەکاتەوە، بینەر دەبێت هەست بەو دەرچوونە لـە چوارچێوەیــە بكـــات، چونکـــە لـــە تـــابلۆی ئیمپریشـینیدا نـاوەڕۆکی تابلۆکـان لـە دەرەوەی

چوارچێوەشـــدا خۆیـــان درێـــژ دەکەنـــەوە، ئیمپریشیۆنیســـتەکان دەستپێشـــکەری ئـــەو گۆشەنیگایە بوون، ئـەو حـەز و ڕوانینـەیان بینا کـرد، کـە ئـەوان بـە مەبەسـتەوە دەیانـەوێت ئـەو کاریگەرییـــە بـــبزوێنن، کـــە دەتوانرێـــت هـــەڵڕژانی ڕونـــاکی لـــە دەرەوەی ســـنوورەکانی چوارچێـوە بوونـی خـۆی کۆرپـەیی بکـات و بـە بێســـنوورییەوە ژوور و شـــوێن پڕبکـــات لـــە ڕوناکیەکانی خۆی.

به ماناترین کاری ئیمپریشینستەکان به  پلەی یەکـــەم لـــەوەدا بـــوو، کـــە ئـــەوان هونـــەری نیگارکێشانیان لەخۆ بەستنەوە به  بابەتـەوە ئازاد کـرد، ئـەوان توانیـان هونـەر سـەربەخۆکەن، نـەك بابـەت، بـەڵام لـە هـەمان کـاتدا دەرکپێکردنـی ڕاستەقینەیی بابەت خەمێکی سەرەکی هـەمووان بوو.

جـۆرج ڕیڤـێر Georges Riviere یەکێکـە لـەو کەســـانەی زۆر چالاکانـــە لـــەنێو گرووپـــی ئیمپریشینســـتەکاندا بـــەرگری لـــەم شـــێوازی کارکردنـە کردبـوو، ئـەو بـە تـەواوەتی توانـی

PDF 4 KURD



پێناسەی ئەم نوێخوازیە بکات لە هونەری نیگارکێشانداو گوتویەتی:

(جوداوازی ئەم گروپە نیگارکێشە لەوانی دیکە لەوەدایە، کە ئەمان لە خودی ئیرادەی بابەت خۆیەوە مامەڵە لەگەڵ بابەتێکدا ناکەن، بەڵکو لە خودی تۆنی ڕەنگەکانی بابەتەوە مامەڵە لەگەڵ بابەتدا دەکەن).

سەرەتاکانی سیزان یش Cezanne سەرەتاکانی بوو وەك ئەندامێك لەنێو گروپی ئیمپریشینیستەکاندا، لە هەمان کاتیشدا شێوازی کارکردنی ئەم گروپە لە بەرنامەیەکی تێکەڵ بەسەرسوڕمان و بە چاوێکی ڕەخنەگرانەوە هەڵسنگاندووە، لە یەکێك لە هەڵسەنگاندنەکانیدا بە کۆمەڵێ وشەی جوان مۆنێ Monet ی وەسفکردووەو دەڵێت.

تەنها چاوێك، بەڵام ئای لەو چاوە!

PDF 4 KURD



## پەرەسەندنی ئیمپریشێنیزم

هەر لە ساتی کردنەوەی یەکەم پێشانگایاندا ئیمپریشینستەکان گەیشتنە لوتکەیەکی بالآی ژیانی هونەریان، ئەمان هەموویان لە نزیکەی ١٨٤٠دا لەدایکبوو بوون، هەمووشیان دوای کردنەوەی یەکەم پێشانگەیان دەبوایە ڕووبەڕووی دیدی پارێزگار خوازانەی هونەرمەندانی ڕژێمی پاریس ببنەوە، ڕووبەڕووبوونەوە لە بەرامبەر -سالۆن-ی پاریسی و شاگردەکانیان کە لە گۆشەنیگای کۆنەپەرستانەوە هەڵدەسورێنران، ئەوانە ڕایەڵێکی درێژبۆوە بوون بە ترادیسیۆنیەت و کۆنەخوازی هونەری نیگارکێشان.

هەر لە سەرەتای شەستەکانەوە ئەو هونەرمەندە لاوانە شێوازی کۆنەخوازی کلاسی و تەقلیدیان ڕەتکردەوە، ئەمان بە جیا دوو گرووپیان دامەزراند، یەکەمیان -ئەکادیمیای ئازاد- بوو کە

PDF 4 KURD

خـۆی لـە خۆیـدا سـتۆدیۆی نیگارکێشـێکی ئاکادیمی (چارلس گلێر– Charles Gleyer) بوو کە (بە ڕاستەقینەییەوە –جدی– بیری لە ڕەچەڵەکی شتەکان دەکردەوەو بە دڵی بوون)، لەم ئاکادیمیا ئازادە نیگارکێشی وەك مۆنیێ، سیسلی، بازیل، ڕێنوار، یەکیانگرتبوو. دووەمیشیان (ئاکادیمی سویسـرە – Academie Suisse) بـوو، لـەم ئاکادیمیایـە قوتابیـان بـەبێ بوونـی مۆدێـل نیگارکێشـیان دەکـرد، لـەم ئاکادیمیایـەدا نیگارکێشـی وەك پیسـارۆ و گویلاومـین Guillaumin و سیزان یەکیانگرتەوە.

ئیدوارد مانیێ یەکێك بوو لە ڕابەرانی وشەی ئـەم ڕێبـازە نوێیـە، مانـێ بـە تەمـەن دە سـاڵ لـە هەموو گەورەتر بوو، لە هەمانکاتیشدا لە ترۆپکی ئەفراندنی هونەری خۆیدا بوو، لە ساڵی ١٨٦٣دا تـابلۆ بەناوبانگەکـەی (فراوێنێـك لەدەشـت)(*)دا، گفتۆگۆیـەکی تونـدو تیـژ و وروژاندنێکـی حەیابەرانـەی فڕێدایە نێـو نێوەنـدی نیگارکێشـی کلاسیکەوە، ئەم تابلۆیە بە جودا لە تڕادیسیۆنی تـابلۆی کلاسـی، دوو ژن و مـێردی مۆدێرنـی

PDF 4 KURD



نیشـاندەدا. مـانێ لـەم تابلۆیـەدا پیاوەکـانی بـە تـەواوی جلوبەرگـەوە، ئافرەتەکانیشـی ڕووت و نیوە ڕووت نیگار کێشاوە. ئەم هاوئاوازیە لەگەڵ کارەکـانی سـەدەی شـازدەدا هاوبەشـی هـەبوو، خاڵی جوداوازی لەوەدا بوو لە جیاتی خوداکانی ڕووبار و ئاو کە بەردەوام لە تابلۆی کلاسیکدا بە ڕووتـی نیشـان دەدران، ئافرەتـەکان بـە ڕووتـی لـەنێو سروشت و چیرۆکـەکانی تابلۆکـاندا نیگـار دەکێشران بە پێچەوانەی ئەو وێنە ئەفسانەیی و میتامۆرفۆسـیەتیەوە، مانـێ مرۆڤـی سـەردەمی خـۆی کێشـابوو. ئـەم تابلۆیـە لەلایـەن پارێزگاریخوازەکـانی نێوەنـدی کلاسـیکەوە بـە تونـدی بـەر شـاڵاوی ڕەخنـە کـەوت، بـەڵام لـە هەمانکاتیشـدا سەرسـوڕمانێکی لـەو نێوەنـدەدا وروژاند. تەنها بابەتی تابلۆکە نەبووە هۆی ئـەو وروژاندنە، بەڵکو تەکنیکی تابلۆکـەش خـۆی لـە خۆیـدا لەگـەڵ.. بـاوێتی -کۆنڤێنتسـیونێل/ Konventionell نیگارکێشـاندا نـەدەگونجا، هەروەها نەدەگونجا لەگەڵ ئـەو فڵچـە وەشـاندنە پڕبیرکردنـەوە وردەی کلاسـیك، کـە زیـادەتر لـە

بوونی مۆدێلەوە تەکنیکی وردی خۆی دەچنی. بە پێچەوانەوە مانێ لە تەکنیکی تابلۆی (فراوێن لەدەشت)دا بە فلْچەی پان ڕەنگەکان بە قوڵیەوە لە تەنیشت یەکدیەوە وەك چەندەها ڕووبەری هەڵماوی خۆیان پەخشکردبۆوە.

مانێ یەکەم ڕابەری ئیمپریشیۆنیستەکان نەبوو تا کاریگەری خۆی لەسەر گروپەکە پەخشبکاتەوە، بەڵکو گروپەکە زۆر بەسەرسامیەوە لە هێزی بەکارهێنانی ڕوناکی نیگارکێشێکی وەك (بۆدان Boudin) و (جیۆکەند Jongkin) و ئەتمۆسفێری کارەکانیان دەڕوانی، بە هەمان شێوەش بە سانایی و ڕاستەوخۆی کارەکانی کۆرۆ Corot کاریگەر بوون. ئیدی نوێخوازی هونەری ئەوان لەنێو خودی نەوەی ڕابردوودا ڕەگی خۆی داکوتابوو، لە گۆشەنیگای ئەو نوێخوازیەوە بەردەوام کاریان لەسەر ئەو شتە دەکرد کە بە ڕاستەوخۆیی و زیندوویی دەیانبینی، بەم جۆرە نیشاندانە ڕاستەوخۆ تەواوکارە دەلاقەی نێوان ئەوان و ئاکادیمیای تڕادیسیۆنالیستەکان گەورە و

گەورەتر دەبوو. ئەمان سوور بوون لەسەر ئەم ڕێبازەیان، ئەوە بوو کاتێك لە ١٨٦٤دا ستۆدیۆکەی گلێر Gleyres داخرا، خەمی ئەوان ئەوە نەبوو بەدووی ئاکادیمیایەکی دیکەدا بگەڕێن، بە پێچەوانەوە ئەوان ڕوویان کردە سرووشت، سرووشت وەك ستۆدیۆیەکی بێسنوور، مۆنێ و هاوەڵەکانی بەنێو سروشت و دیمەنەکانیدا بڵاوبوونەوە، هەر لە کێڵگە نووستووە سەوزەکانەوە بیگرە تاوەکو لادێکانی دەرەوەی پاریس، تاوەکو ژیانی پڕ قەرەباڵغی ڕوناکی و سێبەری شارە گەورەکان، ئەوان لە دوو ئیدۆلی مەزنی ڕوانینیان بۆ نیگارکێشان کاریان دەکرد، ئیدۆلی دیمەنی سرووشتی و ئیدۆلی ژیان لەنێو شارە گەورەکاندا، ئەمانە هەمووی لە کارەکانیاندا ڕەنگی دایەوە.

لە ١٨٦٩ مۆنێ و ڕێنوار لە شارۆچکەی بۆگیڤال Bougival کە زۆر لە پاریسەوە دوور نەبوو، سەرقاڵی کارکردن بوون لە پەرەسەندنی تەکنیکێکی نوێی ئینتیباعی، ئەویش لە ڕێگەی دانانی ڕەنگ بێئەوەی تێکەڵ بە یەکتری بن و لە

PDF 4 KURD



ڕێگەی فڵچەی کورت، هەوڵیان دەدا ئەو ڕەنگانە لە پەنا یەکدیەوە ئاوێنەبوونی ئاسمان بێت لە دەریاچەکەدا، بەردەوام کاریان لەسەر ئەوە دەکرد ئەو پێچەوانەیە لەسەر خامی سپی نیشانبدەن، لەپاڵ ئەمەشدا زۆر بە وردی کاریان لەسەر دانانی ئەو ڕەنگانە دەکرد لە پەنا یەکتری، بە شێوەیەك ڕەنگەکان بێئەوەی تێکەڵ بن، ڕەنگدانەوەی ڕەچەڵەکی خۆیان بن کە بە هۆی سێبەر و ڕوناکی لەسەر ڕووبەری دەریاچەکە گۆڕانیان بەسەردا دەهات، ئەم تەکنیکەیان شێوازە کارێکی زیندووی نیگاری ڕەنگ و بینراوەکانی دنیای ڕیاڵ بوو.

پیسارۆش بە هەمان شێوە زۆر لە نزیکی بۆگیڤال سەرقاڵی هەمان تەکنیك و گرفتی پەرەسەندنی ئەم شێوازی کارکردنە بوو. ئیدی گروپی ئیمپریشیۆنستەکان پەرەیان بە کاری خۆیان دەدا، بۆ زێدە بیروڕا گۆڕینەوەو کاریگەر بوون بە ڕەوشی یەکتری، لە پاریس، لە قاوەخانەی گوێربۆ Guerbois و بە ئامادەبوونی مانێ کەوتنە بیروڕا گۆڕینەوە، مانێ وەك

PDF 4 KURD

فیگورێکی سەرەکی هەڵسورێنەری ئەو گفتوگۆ ئیمپریشۆنیە بوو، ڕێنوار، مۆنێ، سیزان، بازیل، زۆلا، ناداری فۆتۆگرافیش ئامادەی ئەو گفتوگۆیە بوون. ئەوەی شایانی باسە نادار نیگارکێش نەبوو، فۆتۆگرافی بوو، بڕیار وابوو ماوەیەك دوای ئەو گفتوگۆیە لە ستۆدیۆکەی ئەودا یەکەم پێشانگای ئیمپریشۆنیستەکان بکرێتەوە، بەلاّم جەنگی نێوان ئەڵمانیای بروسی و فەرەنساکە لە ١٨٧٠دا هەڵگیرسا، ئەم هەڵسانەوە هونەریەی پێبڕین، ئیدی هاوڕێ ئیمپریشیۆنەکان لە یەکتری دابڕان، بازیل لە شەڕدا کوژرا، سیزان گەڕایەوە بەرەو باشوور، بۆ شاری ساتەوەختە ڕاکردووەکانی منداڵی، ڕێنوار دوای گواستنەوەی بە قورسی نەخۆش کەوت، مۆنێ و پیسارۆ بەرەو لەندەن سەفەریان کرد، لەوێ کەوتنە دیراسەکردنی کارەکانی ولیەم تێرنەر و جۆن کۆنستابڵ، ئەوان کەوتبوونە ژێر کاریگەری تەکنیکی بێزۆر لەخۆکردەی مامەڵەی نیگارکێشە ئینگلیزەکان لەگەڵ ڕوناکایدا. لەوێ بازرگانێکی کاری هونەرییان ناسی کە نێوی پاول دوراند

PDF 4 KURD



ڕۆیل بوو، پاول لە دواییدا بووە یەکێك لە بەرگریکارە بەهێزەکان لە هونەری ئەم دووانە.

ساڵی ١٨٧١ پیسارۆ گەڕایەوە بەرەو فەرەنسا، لە هەمانکاتدا مۆنێ ویستی پێچە دەورەیەك بکات لە گەڕانەوەیداو بەرەو هۆڵەندا سەفەری کرد، کەناڵە ئاوییەکانی تساندام Zaandam سەرنجی ڕاکێشاو ئەو کارانەی کاتی خۆی لە بۆگیڤال لەمەڕ شکاندنەوەو ئاوێنەبوونی تیشك و پێچەوانەبوونی ڕەنگەکان لەسەر ڕووبەری ئاو کاری تێدا کردبوو، توانی جارێکی دیکە لە تساندام دەست بە پەرەسەندنی هەمان تەکنیك بکاتەوە.

ساڵی ١٨٧١ بەشی زۆری گروپەکە جارێکی دیکە، دوای ئەم ئەزموونە کەسی و هونەریە قووڵانە لە پاریس و دەوروبەری یەکیان گرتەوە: مۆنێ لە ئارگێنتۆیل Argenteuil گیرسایەوە، پیسارۆ لە پۆنتوا Pontoise کاری دەکرد، ساڵ، ئەو ساڵە بوو کە تابلۆ بەناوبانگەکەی مۆنێ (Impression, soeil levant– لەخۆر هەڵاتن ڕوانین)ی تێدا دەرکەوت، ئەو تابلۆیەی کە

نوێنەری ستایل و شێوە کارکردنی ئیمپریشنی لە خۆیدا بەرجەستە کردبوو.

لەندەن گەورەترین مانا و سوودی بە مۆنێ و پیسارۆ بەخشی، پەیوەندیان لەگەڵ کاری نیگارکێشە ئینگلیزەکان و سەفەری مۆنێ بۆ هۆڵەندا، دوو هۆکاری گرنگ بوون لە فراوانکردنی ئاسۆگەی هونەری و بوێری ئەزموونگەری داهێنەرانەیان. ساڵێك دوای ئەوە دێگاس لە نیۆرك گەڕایەوە بۆ لای هاوڕێ ئیمپریشینستەکانی، دێگاس کەوتە نیگار کێشانی ژیانی ڕۆژانە، سەماکەرانی کابارێت و تیاترۆخانەکان، سەمای ڕەنگە ڕۆشنەکانی ئەو بوون، بەختەوەریەکانی ئەو بوون لە ڕێڕەوی داهێناندا.

سیزان لە پیسارۆوە هاندرا بۆ کارکردن لەسەر ئەو شێوازەی، کاتی خۆی لەو هاوڕێ دێرینە بە تەمەنەی خۆیەوە فێری بوو بوو، لە جیاتی مۆدێلێکی جێگیرو وەستاو، ڕەنگە کاڵە ڕۆشنەکان لە شێوازی وەشاندنی فڵچەی کورت بەکاربێنێ. پیسارۆ لە شارۆچکەی ئۆڤێرس سور

ئویز Auvers- sur- oise سەرقاڵی پەرەسەندنی ئەو شێوازە کارکردنە بوو.

پیسارۆو مۆنێ پێیان وابوو کاتی ئەوە پێگەییوە پێشانگایەك بکەنەوە، ئەمان بە جووتە گروپەکەیان خستە ژێر پەستانی ئەو رایەی، کە کاتی ئەوە پێگەییوە بە جودا لە چێژی سەردەم و سەلیقەی کلاسی و ناتێگەیشتنی جەماوەری سەرسام بە –ساڵۆن– هونەری رەسمی، چەند پێشانگایەك بکەنەوە. ئەوە بوو لە پازدەی ئەپریلی ١٨٧٤ گروپەکە لە پێشانگاکەیاندا ئەوەیان نیشاندا کە هونەر رێرەوێکی نوێی گرتۆتە بەر، ئەوان ئەوەیان دەبینی کە نەوەی رابردوونەیبینیبوو.

ئەوان هەستەکانیان بە پڕاوپڕی دنیای رەنگ و روناکی و ئەتمۆسفێرو کەشی سرووشت و سێبەریان لە تۆنی رەنگەکانیاندا بەرجەستە کرد، بەرجەستەکردنێك بوو نەوەی رابردوو تەواوی ئەو هەستەوەری و رەنگ و سێبەرەیان هەڵنەسەنگاندبوو، تێپەڕ ببوو بەسەریاندا.

PDF 4 KURD



ژیـــان و کارکردنیـــان لـــەنێو شـــێوازێکی نیگارکێشـــان و بابـــەتێکی هـــاوکۆییدا خـــاڵی یـەکدگیری و پەیوەسـتی گروپەکـە بـوو پێکـەوە، هـەمووان سـەرنجتیژبوون، بـە وردی لـە هـەموو شـتێکیان دەڕوانـی، دیمەنـە سرووشـتیەکان و تابلۆکانی لەمـەڕ گونـدو جوانـی سروشـت جێـی سەرسامبوونێکی بێوێنە بوون، سیسلی سانایی سروشتی نیشـاندەدا، بـە هـەمان شـێوە دیمـەنی ڕوبارەکانی مۆنێ و دیمـەنی دەوروبـەری پۆنتـوا Pontoise و هەموو تیشکی خۆرێك لە فەرەنسادا، جێی سەرنج و سەرسامیەکی گەورە بـوون. هـەر ئـەوەندەش نـا بـەڵکو هـەرای ڕەنگـە گـەرم و هارەکانی ژیانی پاریسی کەوتە نێو هارمۆنیـای فڵچە کورت و ڕەنگە ڕۆشنەکانی ئیمپریشۆنەکان، کیژە سەماکارە بالێیـەکانی تابلۆکانی دێگـاس و جـەماوەری نێولۆجـەکانی شـانۆی سـکێچەکانی ڕێنوار ڕەنگدانەوەی ئیدۆڵی ژیانی قەرەباڵغی شار و پارس بوون.

لـە تابلۆکـانی مانـێدا ژیـانی شـەقامەکان بـە ڕوونی دەربڕینی ڕیتمی ژیانی ڕۆژانە بوو، هەمان

ڕەوشـــی مانــێ لـــە تابلۆکـــانی ویســـتگەی شـــەمەندەفەری –ســـانت لازار Saint-Lazare–ی مۆنــێ ڕەنگــی دابـۆوە، لـەو تابلۆیانـەدا جوولـەی هـەڵمینی ڕونـاکی و لـەرزینی هــەوا لـەژێر پایـە بچوکــەکانی گوێســوانەکاندا ســەمای هــەواو ڕوناکیان لەنێو ڕەنگدا بەرجەستە دەکرد. هەموو ئــەم مۆتیڤانــە چــەندەها بەشــی یەکەیــەکی یــەگرتوون، ئــەویش دەســەڵاتی زاڵــی چــاوی هونەرمــەندە لــە هەســتکردنی بــە ســاتە بەختەوەریەکانی ژیان، ئەو ساتانەی لە جووڵەدا گوزارشتی لـەخۆی دەکـردو لـە ڕەنگیشـدا خـۆی پەخشدە کردەوە.

ســـەرەڕای نـــاڕەزایی جـــەماوەر و ڕەخنـەگرانی ئـەو سـەردەمە، گرووپەکـە بـەردەوام بــوو لــە کردنــەوەی پێشــانگا، دیــارە ئــەو نادڵیــەی جــەماوەرێکی فــراوان هۆکــارێکی ڕووتــەیی و هــەژاری هونەرمــەندەکان بــوو، ســەرەڕای ئەمانــە نیگارکێشــە لاوەکــان بەردەوامییان بە کارەکانیاندا، گرووپەکە لە هەزار و هەشــت ســەدو حــەفتاو حــەوت/ حــەفتاونۆ/

PDF 4 KURD



هەشـتا/ هەشـتاویەك/ هەشـتاو دوودا چـەندەها پێشانگەیان کردەوە.

ئیـدی چـەندەها نـەگونجان و دژە ڕا لـەنێو گروپەکـەدا وردە وردە سـەریهەڵداو چـەندەها ئـەندامی گروپەکـە کۆمەڵەکـەیان جێهێشـت، لـە ساڵی ١٨٨٣ مانێ کۆچی هەتایی کرد. پێدەچوو لـە مردنـی مـانێوە پەرەسـەندنی ئیمپریشـێنەکان ڕێڕەوێکـی دیکـەی گرتبێتـە بـەر، نـەوەی نـوێ دەرکەوتن و چوزەرەیان کرد، ئیدی نەوەی نوێـی ئیمپریشیۆنیسـتەکان گوزارشـتیان لـە خۆیـان دەکرد.

هەشـتەمین و دوا پێشـانگەی گروپەکـە لـە ١٨٨٦دا کرایەوە، هەر لەم ساڵەدا بوو ڤانکوخ لە ژیانی هونەری پاریسیدا دەرکەوت و گۆگانیش لە پۆنت ئافێن Pont- Avenی دوورگـەی بێرتاگنـێ دەرکـەوتن، ئەمانـە هـەمووی پابـەند بـوون بـە سـەرەتای وەرچـەرخان لـە ڕەچەڵـەکی ئیمپریشێنزم.

## ئەو هونەرمەندانەی دژی ئیمپریشیۆنیستەکان ڕاوەستان

ئەم نیگارکێشانە لە ڕەچەڵەکەوە ڕەگەکانیان دەگەڕایەوە بۆ گرووپی ئیمپرشیۆنیستەکان، بەڵام مانگرتنیان مانای ڕەتکردنەوەی ئیمپریشیۆنیزم نەبوو، بەڵکو ئەوەی ئەوان دژی وەستانەوە، ئەو شێوازی پشت بەستنە سنوورپەڕە بوو بەچاو، ئەوان نابەڵەدی بەرامبەر ئەم جۆرە کارکردنە لە ڕێگەی چاو و بینراو وەستانەوە، ئەمەش هۆکارێکی سەرەکی ئەوە بوو کە ئەوان ئەو هەستکردنەیان دەربڕن. لێرەوە دیسانەوە ئەو پێناسەیەی لیۆناردۆ داڤنشی کە هونەری نیگارکێشان (هەلێکی ڕەخساوی ئەقڵانیەتە) خرایە بەر باس و لێکۆڵینەوە، نیگارکێشە گەنجەکان و هەندێك لە پیرەکانیش وەکی پیسارۆو ڕێنوار ڕەخنەیان لە ئیمپریشیۆنزم

گـرت، کـه چـۆن بـه ئەقڵیــەتێکی دیــاریکراو و ســنووردراوی پێوانکــار بیریــان لــه هونــەری نیگارکێشان کردۆتەوە.

ئــەم وەرچەرخانــە وەك بابــەتێکی بنــەڕەتی لەلایەن جۆرج سیورات تـەعبیری لـە خـۆی کـرد. ئـەو شـێوازە کـەیف خۆشــی و ئارەزوومەندیــە تێکـەڵ بـە چێـژو ڕیتمـی ئیمپریشــیۆنە کلاسـیە لەگــەڵ ئــەو نــەدەگونجا، لەگــەڵ تەکنــەلۆژیاو سیستمی پێویست ناوازە بوو، هەر ئەمە بوو وای کــرد کــە ئــەو داهێنــان بکــات لــەم بــوارەداو (ئیمپریشـــیۆنزمی زانســـتی) دامـــەزرێنێت، تیۆرەیەك تێدا هێزی سمبۆلی ڕەنگ و هێڵکاری بە تەکنەلۆژیاوە گرێدا، تێدا ڕوونی کردەوە کە چۆن ڕەنگە پاکژەکان لە پەنا یەکدیەوە دادەنرێن. لـە خــاڵی بچووکــی ڕەنگـــەوە ســـیورات توانـــی هارمۆنیەکی نوێ و بڕیارێکی نوێ لە تیۆرەکەیدا بخاتــە ڕوو کــە ســـتروکتوری تــابلۆو تۆنـــی ڕەنگەکانی نوێتر نیشان بدات، ئەمانە هەمووی بە شێوەیەکی زانستی وەك بنەمایەکی کارکردن لەو تیۆرەیەدا ڕوونکرایەوە. هـەر ئەمـەش بـووە هـۆی

بەدەستهێنانی ڕێزێکی بێپایان، جا لەبەر ئەوەی سیورات سەلەفێکی گەورەی ئەم تەکنیکە نوێیە بوو، ئەم تەکنیکە تازەی سیورات نێوی – ئیمپریشیۆنزمی تازە Neoimpressionismusی لێنرا.

یەکەم تابلۆ کە ئەم تەکنیکە نوێیە لە خۆیدا بەرجەستە بکات(**)، لە ١٨٨٥داو لە لایەن سیوراتی جوانەمەرگ خۆیەوە نیگار کیشرابوو، تابلۆی (نیوەڕۆیەکی یەك شەموان لە ئیلی دیلا گراندێ یاتێ) دەربرینیکی تەواوی هونەری هیل و تۆنی ڕەنگەکان و دانانی ڕەنگ بوو لە پەنا یەکدی، لە هەمان کاتیشدا سیوراتی جوانەمەرگ (*سیورات لە ١٨٩١ لە تەمەنی سی و یەك سالیدا کۆچی دوایی کرد/ ئیسماعیل) هەولیدا لە تابلۆکانیدا ئەقلانیەت و هۆشمەندی فەرەنسی لە سنوورەکانی ئیمپریشیۆنزمەوە ریگەیەکی نوێ بۆ خۆی بدۆزیتەوە.

ڤانکوخیش ماوەیەکی زۆر لەگەل ئیمپریشیۆنیستەکاندا خۆی خەریك کرد، ئیمپریشیۆنزمی نوێ/ پۆست ئیمپریشیۆنزم

PDF 4 KURD

کاریگەرییەکی باشی هەبوو لەسەر شێوەی نیگار کێشان، بە تایبەت لەو تابلۆیانەی ١٨٨٧ لە پاریس و لەمەڕ پاریسەوە نیگارکێشی کردبوو، حونجەتەکانی لە دژی ئیمپریشیۆنیستەکان لەو بڕوایەوە چەکەرەی کردبوو، کە هەڵەکاری و خەوش هەیە لە ڕێگەی هەست و ئارەزوومەندییەوە. لە پۆرترێتێکی هاوڕێیەکیدا ئەو جۆرە باوەڕانەی خۆی بەرجەستە کردووە، لە نامەیەکدا لەمەڕ ئەو پۆرترێتە نووسیبووی (من دەمەوێت لەم پۆرترێتەدا هەموو هەست و هاوڕێیەتیم تەعبیر لە خۆی بکات.. لە پێناو ئەو خود دەربڕینەدا دەبم بە سۆزیارێکی بزێوی هەڵچوو، دەبم بە حەماسێکی کارە ڕەنگاڵەکان، لە پێناوی ئەوەشدا زێدەڕۆییەکی سنووربەڕ دەکەم لە بۆیەی زەردی قژەکانیدا)، ئەم مامەڵە ئەفراندنیە لەگەڵ ڕەنگدا میراتیەکی ئیمپریشیۆنی بوو بۆ ڤانکوخ مابۆوە، ئەو لە ئیمپریشیۆنیستەکان و کاری چاپی یابانی زۆر فێربوو، فێربوو لە ڕێگەی ڕەنگەوە تەعبیر لە خۆی بکات، هەموو کارەکانی لەسەر ڕەنگ خۆیان

PDF 4 KURD



دامەزراند نەك لەسەر بنچینەی بینراوی ڕیالیزمی ئیمپریشیۆنیستەکان.

لە باشووری فەرەنسادا کارە داهێنەرەکانی ئەو و ساتە ڕاستەوخۆکانی، کارە پێگەیشتووەکانی سەریهەڵدا، لە نامەیەکیدا بۆ برایەکەی -تێو- نوسیبووی (ئەوەی مرۆڤ خۆشی دەوێت ئەو شتەیە کە بە جوانی و ڕوونتر دەیبینێ، ئایا بە هەق وانیە؟)، ڤانکوخ دۆلآبی تەختەی ئیمپریشیۆنیستەکانی بە ئازارە بێسنوورە دەوڵەمەندەکانی شکاندو بەو حەماسە ڕاچڵەکیووە ختوکەهێنەرانەیەوە ڕێچکەیەکی هونەری نوێی والآ کردەوە.

لەو کاتەدا کە تابلۆ بەهرەمەندەکانی ڤانکوخ لە باشوور سەریهەڵدا، پاول سیزانیش لە باشوور هەوڵی تیۆریزەکردنی ڕوانینێکی نوێتری ئیمپریشیۆنستی بوو، ڕوانینێك دنیا لە گۆشەنیگایەکی دیکەوە ڕێڕەو بکات. (بە چاو بیربکەینەوە)، بەم ڕستەیە پێناسەی ئەرکەکانی نیگارکێشی کرد، بەم شێوەیە وەرگرتنی ڕاستەقینەی شتەکان دەبێت پێچەوانە بێتەوە،

بەم شێوەیە سیزان ئەوەی لە ئیمپریشیۆنیستەکان، وە بە تایبەت لە مامۆستاکەی پیسارۆوە فێر بوو، بوو بە بنەمایەکی نوێگەرایی ئەو، ئەو بنەمایەی کە دەبوایە ئەو وەك ئەرکێکی سەرشانی لە ڕێگەی بیرکردنەوە بەچاو پەرەی پێبدایە.

بیرکردنەوەیەکی بینینی بە بڕوای سیزان بۆ ئیمپریشیۆنیستەکان و هەستیارییەکی نیگارکێشانەی لە سەروو هەموو خودخوازیەکەوە، نوێبوونەوەیەکە لەو ڕێڕەوە، لێرەوە سەنگینی کارەکانی لە سەرچاوەکانی خۆشبەختی و هەستە کەسیەکانەوە خۆی نەچنیبوو، بەڵکو زێدە لە هاوئاوازی ستروکتوری تابلۆکەوە خۆی چنیبوو، ئەو لەو بڕوایەدا بوو، هەموو فۆرمێکی سروشتی دەتوانرێت بەپێی گونجاندنی لەگەڵ بابەتی تابلۆدا کاری لەسەر بکرێ، بۆ نمونە هەموو شتێکی خڕ یان لوولەیی، قۆقزی دەتوانرێت لە فۆرمی بینراوی سروشتیەوە لەنێو بابەتی تابلۆکەدا شێوەیەکی دیکە لەخۆ بگرێ.

PDF 4 KURD



لــەم ڕوانینــە نوێیــەوە بــۆ کــارکردن لەســـەر بینراوەکــان، ســـیزان هـــەوڵی دا ئـــەم نەخشـــەی داهێنانــە نوێیــەی پراکتــیزە بکــات، لـــە پێنــاو جیــهانێکی نــوێ بــۆ تــابلۆ و ڕوانینێکـــی نـــوێ پێویست بوو هونەری نیگارکێشان ئەم نوێخوازیە لە هۆشمەندیدا بەرجەستە بێت، بیرکردنەوەیــەك ڕێڕەوو ڕابەرێکی نوێ بێت بۆ ئەفراندن.

پاول گۆگانیش بۆ ماوەیەکی کورت لە ئـارل هاوەڵ لەگەڵ ڤانکوخ کاریــان کـرد، تـاوەکو ئـەو ساتەی گۆگــان لەگــەڵ ڤــان کـوخ تێکچــوو ئــارلی بەجێهێشــت، گۆگـان دەیویســت بــەجیا ڕێــڕەو و ســتایلی خــۆی هــەبێت، وەکــو چــۆن ســیزان لــە پیســارۆوە زۆر شـێوازو بـیروڕای نــوێ فـێرببوو، ئاواش گۆگــان لــە ئیمپریشــیۆنزمەوە پــەرەی بــە کــارە هونەریــەکانی دەدا، تابلۆکــانی لــە ١٨٨٠دا لەگەڵ گروپێك لە نیگارکێشانی دیکە، تێکڕا، لە پێشانگەیەکدا نیشاندران، بەڵام لە دوای وی، ئەو دەیویســت بــەدوای شــێوازی تایبــەتی خۆیــدا بگەڕێ، بەمشێوەیە گۆگان ئامۆژگاری ڤـانکوخی دەکـرد کـە زیــاتر لــە یادەوەریــەوە نیگارکێشــی

PDF 4 KURD



بكات، وەك لەوەی لەنێو ژیاندا بەدووی بابەتدا بگەڕێ، شێوازی نیگارکێشانی گۆگان لەچاو و بینراوەوە سەرچاوەی هەڵنەگرتبوو، زۆر لەوە دوورتر و فراوانتر، لەوەی بە شێوازی ئیمپریشیۆنی تەقلیدی لە هەڕەمەکی ڕەنگ و چاوخوازی شتەکان و ڕێکەوتگیریەی ئەوان نیگارکێش بکات، تەواو بە پێچەوانەوە ئەو بە بیرکردنەوەی قووڵ لە نهێنیەکانی بوون و ژیان بە هەموو دووریەکانیەوە، بە هەموو پرسیارە قووڵەکانیەوە خۆی لە شێوازی ئەودا بەرجەستە دەکرد، پرسیاری وەکو (ئێمە کێین؟، لە کوێوە هاتووین؟، لە ژیانماندا بەرەو چ ئامانجێك ڕێگە دەبڕینە بەر؟) پرسیار وروژاو بوون لای گۆگان، وەڵامدانەوەی لەنێو بابەتی تابلۆکانیدا خۆی کۆڕپەیی دەکرد.

ناوچە دوور و ساکارەکانی بریتانی Bretagne و مارتینك Martinque و دوورگەکانی باشوور، هەڵبژاردنی ڕەنگەکانی بەپێی ویستی خۆی نەك سەپاندنێکی بینراوی سروشتی، سادەیی فۆرمەکانی کە لە شێوەی فڵچە پانە سادە کانیەوە

PDF 4 KURD

خۆیـان نیگـارکێش کردبـوو، دەربڕینـی جیهانـە سـیحریەکانی گۆگـان و کاردانـەوەی بیروڕاکـانی بـوو لـە شـێوازی نیگارکێشـانی ئیمپریشینسـتیەتدا، لـە ڕاستیشـدا تابلۆکـانی دوورگەی تاهیتی Tahiti زێدەتر سیحرئامێزە وەك لەوەی ڕاستەقینەی چاوێك ئەو دنیایە بە ڕاستی نیشانبدات.

ڕاسـتە دێگـاس تاکۆتـایی بـە وەفـا بـوو بـۆ ئیمپریشیۆنیسـتەکان، بـەڵام لـە سـەرجەم کارەکانیدا هەست بە جیاوازی شێوازی کارکردنی ئەو دەکرا، بۆ نمونە لە نیگارکێشێکی وەك مۆنێ. لە ١٨٨٦دا بە چەندەها ئەکتی دراسی و بە کاری پاسـتێل بەشـداری پێشـانگایەکی هاوبەشـی ئیمپریشیۆنیستەکانی کـرد، لـەم پێشـنگایەدا هەسـت بـەو جیاوازیـە دەکـرا، جیاوازیـەك کـە ئارەزوومەندی کاری دێگاس بۆ هێڵ نیشاندەدا، هێڵـەکان لای دێگـاس فۆرمـی شـتەکانیان سـنووردار دەکـردو هێڵـەکان لـە چوارچێـوە دیارەکـاندا خۆیـان بـە ڕوونـی نیشـان دەدا، لـەم شـێوازی هێڵـەوە جیـهانی جەسـتەی لـە

PDF 4 KURD



چوارچێوەی ژوورە داخراوەکاندا شێوازباز و گشتاڵیت کرد، جەستە سەماکارەکان لە ژوورەکانەوە سەریانهەڵدابوو، بە شێوەیەك کە هارمۆنیەتی دەبەخشی بە ژوور و چوارچێوەی داخراو. دێگاس بە خەمێکی بێسنوورەوە گرنگی دا بە سێ دووری شتەکان –پانی و درێژی و قووڵی– کە لە دوایدا بوون بە بنچینەی کارکردنی لەسەر فیگور و کاری سیرامیکی، ئەم گرنگی دانەی بەهێڵ و سێ دووری شتەکان هاوئاوازی و جوداوازی دێگاس بوو لە ئیمپریشیۆنستەکان.

هێنری تۆلۆز لۆتریك -Hnri de Toulouse Lautrec زۆر بە دێگاس سەرسام بوو بوو، ئەمەش وایکرد کە دەسەڵاتی هێڵەکان بدۆزێتەوە، بەڵام بە پێچەوانەی دێگاس کە هێڵەکانی فۆرمێکی تایبەتیان دەنەخشاند، هێڵەکانی لۆتریك لە زەخرەفەوە بینینیان بەرەو شێوەی گوریس دەنەخشاند، ئەم کارکردنە لەسەر دووری شتەکان، گۆڕانی زەخرەفە بۆ هێڵ و شێوە گوریسی وەرگرتن، تەکنیکێك بوو لە میتۆدەکانی گرافیك و کلێشەکاری نێزیك دەبۆوە بەمشێوەیە

PDF 4 KURD



لۆتریــك خولقێنــەری هونــەری نیگارکێشــانی پلاکات/ ڕیکـلام بـوو، ئـەو بـەم شـێوازە نوێیـەی دەلاقەی نێوان هونەر و ژیانی ڕۆژانەی پڕکردەوە.

لــە ســەروو هەمووانــەوە لــە ســتایلی ئیمپریشیۆنیزم و سەرچاوە دێرینەکەیەوە هەوڵی ڕێڕەوێکی نوێـی دەدا. کـلاود مۆنـێ لـە تەمـەنی پـەنجا سـاڵیداو لـە ١٨٩٠دا لاپەڕەیـەکی نوێـی ئیمپریشینسـتی هەڵدایـەوە. لـەو سـاڵانەدا لـە سوسـتێمێکدا کـاری دەکـرد کـە خۆشـبەختی و ڕەسـەنی پێکـەوە لـە نیگارکێشـدا ڕەنگیـان دەدایەوە، ئەم سوستێمە لە نمونەی ئەو کارەیدا بوو کە لە یەك کاتدا لە چەند تابلۆیـەکدا کاربکات کە هەموویان بە زنجیرە خاوەنی یەك بابەتن، بەڵام لە ڕووی گۆڕانی تیشکی خۆرو گۆڕانکاری بەیانی و نیوەڕۆ و عەسرو ئێوارەو بۆلێڵدا ڕەنگو تیشك و ڕوناکی لە تابلۆکاندا بە جیاوازی دەردەکـەوتن، زنجـیرە تـابلۆی -کەڵەکــەبوون، سـپیدارەکان، ڕوونمای کاتێدرالەی ڕۆوێـن- لـە هـەر یـەکێك لـەو زنجـیرە تابلۆیانـەدا، لـە یـەك شـوێن نیگـارکێش کرابـوون بـەڵام لـە کـاتی ڕۆژانـەی جیـاوازدا:

PDF 4 KURD

تابلۆیەك کەلە بەیانیدا کێشراوە، مۆتیڤێکی لەو کاتەدا نیشانداوە جودایە لەوەی لەپاش نیوەڕۆ یاوەکو ئەوەی ئێوارە نەخشێنراوە، ئەمەش جوداوازی ناسکی ڕەنگ و ڕۆشنایی نیشان دەدا کە لە لایەن مۆنێوە، لە هەڵبژاردنی یەك بابەتیەوە دورییە گۆڕاوەکانی خۆی نیشان دەدا.

لەو کاتە کورتخایەنەدا کە ئیمپریشیۆنست وەکو ستایلی گروپەکە بوونی خۆی درێژ دەکردەوە، مۆنێ بنەماکانی پەرەسەندنی هونەری مۆدێرن و تازەگەری دامەزراندبوو. بەلای هەموو یەکێکەوە ئیمپریشیۆنیستەکان ئەو هونەرمەندانەن لە بەختەوەریەکانی ژیانەوە، بەختەوەریەکانی خۆیان بەرامبەر جیهان و ژیان دەربڕیوە، ئەم ڕایە تا سەر ئیسقان ڕاستە بەلاّم ئیپمرپیشیۆنیزم زۆر لەوە قووڵتر لە مێژووی هونەری نیگارکێشاندا ڕۆڵی خۆی ئەنجامداوە، یەکەم جار بوو لە هونەری نیگارکێشاندا شتەکان لە تابلۆدا ڕۆڵی پلە دووی پێبەخشرێ، بۆ نمونە لە زنجیرە تابلۆکانی مۆنێدا بابەت و فیگوری شتەکان وەك حونجەتێك بەکارهاتووە بۆ

نیشـاندانی ڕۆشـنایی. ڕەنـگ و ڕۆشـنایی دوو بابـەتی قـورس و کـار لەسـەرکراوی نیشـاندانی سروشـت بـوون، بابـەتی ڕاسـتەقینەیی هـەموو تابلۆکان بوون.

ئیـدی لـە نیگـای ناکاریگـەری هونەرمـەندەوە شتەکانی ئەم جیهانە کەوتنە لەرزین، لە کارەکانی دوایی مۆنێ جیهان لە سەراب زیـادەترە، زیـاتر خۆی درێژدەکاتەوە، نەك هەر زیـاتر لـە سـەراب بـەڵکو لـەم شـێوازو ڕێـڕەوە هونەریـەوە، ڕاسـتەقینەیی لـە ناجەسـتەییەکی ڕوانینگـیردا هۆشمـەندی مرۆیـی بـە ئـازادی و دوور لـە داسەپاندنی شتەکان خودی خـۆی دەدۆزێتـەوە، هـەر لەبـەر ئـەم هۆکـارە ئیمپریشـیۆنیزم وەکـو دەرگایـەکی بچوکـی مـەزنی سـەرەتایی هونـەری تازەگـەر و مۆدێـرن دەستنیشـان دەکرێـت، وەك سـەرەتایەك بـۆ ئـازادبوونی هونـەر لـە بابـەتی داسەپاو.

*–مارکـانتۆنیۆ ڕایمۆنـد Marcantonio Raimond حوکمـی بەهەشـت– تـابلۆی ڕایمۆنـد لەژێر ناونیشانی –حوکمی بەهەشت–

مانێ بە ڕاشکاوییەوە کاریگەری هونەری نیگارکێشانی سەدەی شازدەی بۆ سەر کارەکانی ئاشکرا کردووە. کارە بەناوبانگەکەی -فراوینێك لە دەشتدا- هاوئاوازییەکی بێوێنەیە لەگەڵ هونەری نیگارکێشانی کلاسیکی سەدەی شازدەدا.

ئەم کارەی ڕایمۆند دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ڕینیسانس لە ئیتالیا، هێڵکاریەکە لەژێر کاریگەری ڕافائێل کێشراوە. لە ١٤٨٣-١٥٣٠.

**-ئەم شێوازە بە تنقیطی (خاڵ خاڵی) ناسراوە (تەها ئەحمەد ڕەسووڵ).

PDF 4 KURD



## پەراوێزەکان

١-سالۆن/ وشەیەکی فەرەنسییەو بۆ ئەو هۆڵ و گالێری و هەیوانە گەورانە بەکاریدێنن کە تیایدا تابلۆ هونەرییەکان نوومایشدەکران و بینەر و خەڵکانێکی زۆری ڕاکێشدەکرد.. هەروەها بۆ ئەو هۆڵە گەورانەش بەکاریدێنن کە شاعیرە مەزنەکانی فەرەنسا هۆنراوەکانیان بۆ یەکتری دەخوێندەوە.
(١)ئێنسکلۆپیدیای هونەر- ئەمستردام/ ١٩٩٤ ل ٦٥٤/ حەمەی ئەحمەد ڕەسووڵ.
سالۆن/ یەکێك لە دیاردەکانی سەدەی حەڤدەم بوونی چەندەها سالۆنی ئەدەبی و هونەری بوو، لەم سالۆنەدا چەندەها ڕێبازی شیعری و ئەدەبی و فیکری گەشەی کردووە، دیارە بوونی کەشیکی تایبەت بە هونەر لە نیو ئەو سالۆنانەدا پیویستیەکی ئەوکاتەی ئۆرستۆکراتیەت و خانەدانیەتی ئەورووپی بوو، سالۆنەکانی پاریس لە سەردەمی ڕۆمانسیەتدا لە پیشەوەی ئەو سالۆنانە بوون کە کاریگەری قول و رەگاژۆییان هەبووە لەسەر ریبازە ئەدەبی و هونەرییەکان. -ئیسماعیل-

PDF 4 KURD



٢-گۆستاف كۆربێ/ ١٨١٩-١٨٧٧/ نیگاركیشی ناوداری فەرەنسی، بە باوكی ریالیزمی هونەری شێوەكاری دادەنرێ، كارە هونەرییەكانی رەنگی تۆخیان تیا بەكارهاتوون.. فیگورەكان. بەهێزو توندوپتەوبوون.. ستیل لایف و پۆرتریت و دەشتودەرو لەشی رووتی ژن، لە هەرە كارو جۆری بابەتەكانیتی. ((ئینسكلۆپیدیای هونەر- ئەمستردام/ ١٩٩٤ ل ١٥٥/ و. حەمەی ئەحمەد رەسوول)).

٣-بابەتی ئەدەبی چیرۆك گیرانەوەو نیشاندانی چیرۆكەكانی میتۆلۆژیاو ژیانی مەسیح و كریستومی لە بابەتەكانی هەرە پیشەوەی تابلۆ كلاسیەكان بووە، چیرۆكی لە خاچدانی مەسیح بە چەندەها شێوەو جۆرو رەنگ و هێلكاری لە دنیادا لەلایەن هونەرمەندانی كلاسیكەوە بە تابلۆ نیشاندراوە، چیرۆكی خوداكانی یۆنان زیۆسی خوای خواكان، ئەفرۆدیتی جوانی، ئاپۆلۆی گەشتیار و راوكەر، دیۆنیزی خومار بابەتی چەندەها تابلۆ بوون. بۆ نمونە شیعرو میتامۆرفۆسی (Metahmorphosen - انسلاخات- شێوە بونەوەریە گۆراوەكان) زەمەنی رۆمانیەكان كە لە لایەن شاعیری رۆمانی گەلیك دیرین ئۆڤید- Ovid نوسرابوو، بووە بابەتی سەدەها تابلۆ و پەیكەرو هێلكاری تابلۆی كلاسیكی ئەوروپی، نپتۆن

خوداوەندی ئاو و رووبارو دەریاکان بە چەندەها شێوە پەیکەرو تابلۆ نەخشێنراوە کە چۆن فەرمان دەدات بە خوداکانی رووبارو کانیاوەکان زەوی لە لافاوێکی گەورەدا بخنکێنن.

یوپیتاریش خوای هەموو خوداکان، خوای رۆمانیەکان کە لەوەوپێش لەنێو گریکیەکان بە زیۆس نیوزەد کراوە، خوای هێزو پیلاندانان و ئەشق و راوکەری ئافرەتان بوو لە رەگەزی خۆی وەك خوداو لە رەگەزی ئینس و مرۆڤیشدا ئەشقبازی خۆی سەرمەند کردووە، ئەم خودایە چیرۆکی فراندنی کیژە پاشایەکی لیدەگێرنەوە، کچە پاشاو ئەمیرە نازداری فیۆنیستەکان ئۆیرۆپا یاخود ئەوروپا چیرۆکی یەکیك لەو حەزە لە پرانەی بووە، ئەمە لە کاتێکدا بوو کە ئەمیرەی نازدار لە کەنار دەریادا پیاسەی دەکردو یوپیتەری خودای خواکانی رۆمانی بە یارمەتی خودای بازرگانی و دانوستان و مامەلەکردن. میرکور خۆی لە شێوەی گایەکی جواندا کۆرپەیی دەکات، تاوەکو ئۆیرۆپا پیی سەرسام دەبیت، دەستی لیدەداو لە کۆتاییدا ناتوانێ دژی ئەو حەزە هاژاوەی بوەستێ کە پالی پیوە دەنیت سواری پشتی بیت، لە ئەنجامدا نازدار دەبیت بە تەلەکەوەو لەگەڵ سواربوونی پشتی گاکەدا، گا بەلەسە دەبیت و ئۆرووپا دەفرینێ.. لە

PDF 4 KURD



بابــەتیکی دیکــەی تابلۆیـــەکدا دەبینـــین هاوســـەری یۆبیتار گازندەی حالی خۆی لای هەردوو خوای نیرو میی دەریا تـاتیس و ئۆکیـانۆس دەکـات لـە دەسـت ئەشـقبازیەکانی یۆپیتـاری میردی، ئەمــەو زۆری ئـەو چیرۆك و میتۆلۆژیانە بابەتی تـابلۆی کلاسـی بـوون، نمونەی چیرۆکی پیرۆزی مەسیح بابەتی زۆر لـە تـابلۆ رەنگین و هیلکاریـەکانی رامـبرانت بـوون -ئیسـماعیل حەمەئەمین-.

٤-ئۆژیـن بـۆدان/ نیگارکیشـی فەرەنسـی (١٨٢٤-١٨٩٨)، کارەکانی نیمچە تـەرزیکی ئیمپیریشـنیزمیان تیدایە، هـاوریی نزیکـی گۆسـتاف کۆربـی و میلـی و تۆمـاش کۆوتـریێو پاشـانیش هاوریبـەندی دەگـەڵ کـلاود مۆنـیێدا بـووە.. راسـتە بـۆدان نـەخویندنی تایبـەتی و نـە هیـچ خولیکـی فـیربوونی تـەواو نەکردوە.. بەڵام خۆرسکانە نیگاری دەریاو کەنارەکان و دەشـتودەری سـازداوە، لـە نـاودارترین کارەکـانی؛ (هـەلکردنی رەشـەبا- ١٨٦٤)یـە، کـە لـە مـۆزەی شـیکاگۆ/ ئامۆژگـاری هونـەردا پـاریزراوە. (ئینسـکلۆپیدیای هونـەر- ئەمسـتردام/ ١٩٩٤ ل ٧٩-٨٠/ وەرگیری بۆ کوردی -حەمەی ئەحمەد رەسوول).

٥-بـە باشـی دەزانم بـۆ زیـاتر روونکردنـەوەی ئـەم چەمکە مۆتیڤ بە روویـەکی دیکـەیدا پیناسـە بکـەم

PDF 4 KURD



وەك تۆنیك، بەشێك لە دیمەنیك، جولەی شتەكان، هەموو كردەیەكی حیسی لەگەڵ هەستدا لە چركە زەمەنیكی داهیناندا كار لەیەك بكەن. ئەمە مۆتیڤیەتە لە كاركردندا شیوازی كاریگەری دیمەن و بابەتەكان بوون لەسەر هەست، لەو روانینگیركردنە/ ئینتیباعەی دیمەن و شتەكان شاكارەكان دەچوونە بازنەكانی كاركردن و ئەزمونەوە.. ئیسماعیل.

٦ –مەبەستی لە وینەكردنی شتەكانە بی كەم و زیاد، لە چاوەوە بۆ دەست و فلچە وەشاندن و رەنگ. ئیسماعیل.

٧–لەو وەرچەرخانەدا سیزان یاسای كلاسیكی ئیمپریشینست–چاو، تەنها چاووبەس– دەبەزینێ و خۆی نابەستیتەوە بە بینراوی سروشتی، ئەو بینراوەی كە سەرەتای خالی جوداكردنەوەی ئیمپریسیۆنیستەكان بوو لە نیگاركیشانی كلاسیكی، بۆ جاری دووەم بابەت و وینەی زهنی و خەیال هاتنەوە نیو تابلۆ بەلام بە شیوەیەك كە لە چوارچیوەی بینی روانینگیرانە بیت. پیموایە ئەم پیكەوە بەستنە ئەو ئیستاتیكایەی بیركردنەوەی مۆدیرنە نیشان دەدات كە تەنها رابردوو، شارەزایی و جوانكاری نەوەی پیشوو ناكەنە قوربانی بینراو و تەنها چاوبینین و بەس، بەلكو سنووریكی دیكە،

PDF 4 KURD

وەرچەرخانیکی دیکە لە روانین و هۆشمەندی بەسودوەرگرتن لە رابردوو دیتەوە نیو هەناوی تازە، لەم خالەدا پیموایە سیزان نەك تەنها لە نیگارکیشانیدا نویبوونەوەی ئیمپریسۆنیستی رادەگەیەنێ، بەلکو لە هەمان کاتیشدا هەموو چەمکەکان بە دانەبراوی لەگەڵ کەشی سەردەمی خۆی، کە سەرەتاکانی مۆدیرنە بوو، پیکەوە گریدەدا.

ئیسماعیل حەمەئەمین.

٨-پیم وایە جوداوازی سەردەمی و زەمەنە میژوییەکان یاریدەر بووە بۆ ئەوەی لە روانین و چاوخوازی ئیمپریشیۆنستیەوە بگوازریتەوە بۆ نویبوونەوە لە روانین، لە ریگەی تەرحکردنی ئەم پرسیارە فەلسەفیانەی راستەوخۆ لەگەڵ کیشەی بوونی مرۆڤدا هاوتایە، مۆدیرنە تاوەکو سەردەمی گۆگان و ڤانکوخ چەندەها گۆرانکاری سیاسی و کۆمەلایەتی هینایە کایەوە، هەموو ئەم گۆرانە یاسایی و زانستی و کۆمەلایەتیانە خوین و ئازاریکی زۆر باجەکەی بووە، لەپال ئەمەشدا شوینای مرۆڤ لە بوونەوەریکی پشت بەستوو بە خودا، پاشان بە جوانی سروشتی بینراو، بە بەختەوەریە کلاسیەکان تیکچوون و لەرزینیکی سەمەرەی بەسەرهات. ڤانکوخ لە ئەزمونە کەسیەکانیدا لەگەڵ جوتیارانی کانە

خـــەلووزەکانی بـــەلجیکا، زۆر لایـــەنی رەشـــی ئـــەو سـەردەمە پیشەســازیە گەشەســندووەی بینـــی و کاریگەریـەکی قولی هـەبوو لـە تابلۆکانیدا، بـە هـەمان شیوە هاوەل لەگەڵ ڤانکوخ، گۆگـان پرسـیارەکانی لـە یــادەوەری و هۆشمەندیــەکی فەلســەفی نیگــاریدا تاوتویٚ دەکرد. ئیسماعیل حەمە ئەمین.

PDF 4 KURD

PDF 4 KURD



## بیۆگرافیای نیگار کیشەکان

### جیۆکیند ۱۸۱۹-۱۸۹۱ Jongkind

یۆهان برتۆلد جیۆکیند، سالی ۱۸۱۹ لە شارۆچکەی لاترۆب Latrop لە هۆلەندە چاوی بۆ ژیان هەلهیناوە، خولی فیربوونی هونەری نیگارکیشانی لەسەر دەستی مامۆستای ئاکادیمیا ئاندریس سخیلفاوت/ Andries Schelfout خویندووە.

ئەو مامۆستایەی کەم تا زۆر لەمیانەی رەنگەوە رەوتی رۆمانتیکی تیدەپەراندە نیو باوەشی ریالیزمەوە.. هەربۆیە سەیر نییە پزیزکی ئەو شیوازی رەنگکردنە کارە بەراییەکانی جیۆکیندی تیخکردبیت، گەر بروانینە کارە ئاوییەکانی نۆبەرەی (کیند) زۆر مەحالە لە خودی ژیان جیابکرینەوەو وەك فۆتۆگراف و کۆپی

PDF 4 KURD



دەقیکی کتومت وەك سروشت دەدەن بە دەستەوە..

سالی ١٨٤٦ خولیکی خویندنی خۆرایی (مینحەیەکی دیراسی) وەردەگریّو بەرەو ولاتی هونەر/ فەرەنسا/ دەکەویتە ریّ، مامۆستای ئەم خولەیان تایبەتمەندە بە نیگارکیشی دەریاکە ناوی ئۆژین ئیزابیی/ Isabey Eugeneیەو خویندکارو شاگردەکەی -کیند- بەرەو کەنارەکانی نۆرماندی پەلکیش کرد.. ئەو جیگایەی لە کارە ئاوییەکانیدا رەنگیداوەتەوەو لە دووتویی رووناکی و ئاتمۆسفیریکی زۆر دلگیردا فەراهەم و بەرجەستە بوون..

بەلاّم ناهەمواری تەندروستی کیند ناچاری کرد بۆ ماوەی پینج سالیك و تاوەکو ١٨٦٠ بگەریتەوە جی و شوینی لەدایکبوونی، لەو بەروارە بەدواوەش هەموو سالیك و هاوینان لەسەر رچەو ئەملاولای رووباری سین -لە پاریس، سەرقالی کاری هونەری دەبوو، هەر لەویش بینین و دانیشتنی یەکەمینی دەگەل بۆدان/ Boudin* مانیی لاودا Manet سازدا..

PDF 4 KURD

تیروانین و لیرامانی کیند بەرەو سروشت، بە شێوەیەکی تەقلیدیانەی ئازاد، گرنگترین وەرچەرخان و هەنگاونانیکی بوو بەرەو ئیمپریشینیزم Impressionisme.

سالانیکی دووردریژی تەمەنی، بە مەبەستی نەخشاندنی نیگارو تابلۆ ئاوییەکانی لە کەنارو رۆخەکانی نۆرماندیو نیڤیرس Nevers و گرینۆیل بەسەربردووە، لەپاش ١٨٧٨یش بەدواوە هاوینان دەچووە نزیک لاکوت سانت ئاندرێ/ی سەر بە گرینۆیل، کە ئەوەش بووە هۆکارو فاکتەریك لە ئافەریدەبوونی زمانیکی تایبەت بە کارە هونەرییەکانی، کە لەرەگەز و میتالی سروشت و دەشتودەرەوە مەیسەربووون. کیند جەخت و تەرکیزی زیاتری لەسەر تابلۆ ئاوییەکانی بوو بە پلەی یەکەم، پاشان گرنگی بەکارە رۆنیەکانی دەدا.

جیۆکیند سالانی دوایی تەمەنی لە دوورەپەریزی و گۆشەگیریدا ژیانی دەگوزەراند، لە رادەبەدەر هەست ناسك و هەستیار ببوو، وەك گەرۆك و جاویدانێ بیووچان باوەشی سروشتی

PDF 4 KURD



ئەفسووناوی تەی دەکرد، هەتا لە سالی ١٨٩١ لە لاکۆت سانت ئاندرێ مالئاوایی لە سروشت و هونەر کرد..

مۆنێ Monert و تیکرای هەموو نیگارکیشە ئیمپریشینیستەکانی دیکە، شایەتی و گەواهی ئەو پاکانەیە دەردەبرن کەوا جیۆکیند؛ سیمبۆل واتایەکی بیوینەیە، لە شیوازو ستایلی بەرەبەیانی ئیمپریشینیزمدا.

و. لە هۆلەندییەوە: حەمەی ئەحمەد رەسوول.

PDF 4 KURD



## پیسارۆ pissarro 1830-1903

کامیل پیسارۆ لە سالی ١٨٣٠دا لە بنەمالەو خـیزانکی فەرەنسـی لـە شـاری سـانت تۆمـاس هاتۆتـە دنیـاوە، شـارەکەی پیسـارۆ سـەر بـە دوورگەیـەکی چکۆلانـەی ژێردەسـتەی حوکمرانـی ئەو سـەردەمەی فەرەنسا بوو. هەر لـە سـەرەتای سـالانی خوێندنـی سـەرەتاییەوە لـە پـاریس خولیـای نیگارکیشـی و وێنـە نەخشـاندن لـە دەروونی پیسارۆدا چەکەرەی کردبوو.. لە گەشت و هـاتووچۆی بیسـرەوتی ئـەم هونەرمـەندەدا، دەمیك گەرانـەوە بـۆ نیشـتمانەکەی و دەمیکـیش چەند جارە گەشتی بـەرەو پـاریس سـالی ١٨٥٣ مـەیل و ئـارەزووی بـۆ نیگارکیشـی و سـەرقالی دونیـای شـیوەکاری زیـاتر بـەجۆش دەهینـا. پیسارۆ بە یەکیك لە هەرە سەرەکیترین گروپگەری دامەزرینـەرانی ئیمپریشـینیزم دادەنـرێ؛ لـە

PDF 4 KURD



سەریکەوە بەتەمەنترینیانەو ریبەرە، لە سەریکی دیکەوە کارە هونەرییەکانی لەم بوارەدا بە پیشینەو نۆبەرەی ئەم ریبازە گرنگەی جیهانی هونەری شیوەکاری دادەنریٚ..

وەلی لەو روانگەیەوە کە پیسارۆ سەر بە نیشتمانیکی کۆلۆنی و تەریك و دابراو بوو، ئەمەش ئەوە نیشاندەدات کە نومایش و زایەلەی کارەکانی بریك درەنگوەختیان بەسەرهات و لەو لایەنەوە بیبەختی پیسارۆ بۆ هەموو لایەك ئاشکرایە. پیسارۆ لە سەرەتادا دۆست و هاودەمیکی نزیکی کۆرۆ/ Corot بوو، یەکەم کاری هونەری خۆی کە دیمەنیکی سروشتی بوو لەژیر ناوی -خویندکاریکی کۆرۆ-دا بە مەبەستی نمایشکردنی سالی ١٨٥٩دا بۆ سالۆنی/ Salon نارد.

هەر لەو مامۆستایەشەوە تایبەتمەندیتی و خەسلەتی ئەو ئەوینە فیربوو کە ژیانی رۆژانەو پاکیزەیی و بیگەردی سروشت دەیبەخشی، ئەو نیگارەکانی خۆی -بیٚ یارمەتی و شارەزاییەکی ئەوتۆ- راستەوخۆ و بیٚ پیچ و پەناو تەومژ

PDF 4 KURD



ئامیزی دەنەخشاندن، زۆربەی تیماکانیش بریتی بوون لە باخچەی میوەو میوەجات، یان رچەی نیو کیلگە (باخچەی گولەبەرۆژەو گەنمەشامی یان کەلەرم و کاهوو یان باخی رەزو باخی سیوان/ و.) یاخود بریتی بوون لە نیگاری دەشتودەرو دیمەنی دەرەوەی شار..(١) چەند سالیك بەر لە هەلگیرسانی شەری نیوان (فەرەنساو ئەلمانیا) پیسارۆ مالی لە لۆو- ڤیسینەوە بەرەو سانت- جیرمانی سەر ریگای ڤیرسای گواستەوەو لەوێ نیشتەجێ بوو، بەلام زۆری نەبرد لە سەربازگەو میلیتاری (پراوزیشە) لە خزمەتی سەربازی دەریانکرد و هەر بۆیەشە، لە کاتیکدا پاریس ئابلوقە درابوو، دەستبەجێ بەرەو دەرەوەی شار و زەویە کشتیارەکان هەلات و پاشانیش بەرەو ئینگلتەرە رایکرد، لەوێ بە تەواوەتی خۆی بەکاری نیو سروشت و دەشتودەر نەخشاندن تەرخانکرد.. پاش تەواوبوونی ئەو جەنگە، پیسارۆ گەرایەوە فەرەنساو ئەمجارەیان.

لە پۆنتوا/ Potoise نیشتەجی بوو، لە هەمان کاتدا سیزان/ Cezanneی هونەرمەندیش

گواستیەوەو لە ئاوڤیر/ Auvers نیشتەجی بوو، بەو جۆرەش بوونە نیمچە دراوسێییەك و لیكتر نزیكبوون.. لە ماوەی ئەو چەند ساڵانەشدا پیسارۆ رووی لە ستایل و شیوازی نیگاركیشی ئیمپریشینیزمی داماڵی و مۆركی تایبەتی خۆشی ئاشكرا كرد؛ خەسلەتی كارە هیمن و ئارامەكانیشی ئەوە بوون كە لە سیمایەكی روناك و رەنگی درەوشاوەدا نقوم بووبوون.. هەر سیزانیش بوو كە لەسەر دەستی پیسارۆدا سازدان و هاوگونجاندنی تۆنی رەنگەكان فیربوو، پرەنسیپ و بنەمای وەرچەرخاندنی سیزان بوو كە دوواتر توانی -كارە هونەرییەكانی- لە قالب و دووتویی ناوەرۆك و شیوەیەكی نویتردا برازینیتەوە و ریچكەكەش بەپیزتر دەستەبەر بكات. پیسارۆ ساڵانیكی بەپیزی لە بەرهەمهینان و ئافەریدەكردندا بردە سەرو بە بەردەوامی لە یەكەمین و دوایین پیشانگا هاوبەشەكانی ئیمپریشینیستەكاندا بەشداربوو.. لە دووا ساڵانی تەمەنیدا پیسارۆ توانی لە رووی بەكارهینانی تەكنیكەوە جیپەنجەو مۆركی خودی

PDF 4 KURD



خۆی بسەلمێنێ، کە پاشان سیورات/ Seurat/ی هونەرمەند تەشەنەو گەشەی پێدا.

لە ساڵی ١٨٩٦ەوە تارمایی لیلی بەسەر چاو و دیدەی پیسارۆدا هاتن و بە بینای تاریکەوە ئیدی نەیدەتوانی لەبەر ڕۆشنایی و تیشکی بەهێزدا کاربکات؛ لەو ماوەیەدا بە مەبەستی نەخشاندنی دیمەن و نیگاری شارەکان، لە پشتی (دەروازەی) پەنجەرەی یەکی لە باڵەخانەکانی مەیدانی شارەوە دادەنیشت و کاری هونەریی سازدەدا..

کارە هونەرییەکانی پیسارۆ بەم شێوەیە وێنا دەکران؛ ((ڕۆشن و کراوەو ساکار و سروشتی نیگارە سروشتیەکان و تابلۆ دلفرینەکانی بێگومان ڕەنگدانەوەی یەك هۆکارن و هەر لەویشەوە سەرچاوەی گرتووە کە؛ بەگزادەیی، خانەدانی، ئاکاری بێوێنەو ڕەوشتی زۆر بەرزی پیسارۆیەو هیچی تر، ساڵی ١٩٠٣ لە نیوەندی کارکردنداو لە شاری پاریس دڵی مامۆستاو ڕێبەری خانەدانی ئیمپریشیۆنیستی بۆ

PDF 4 KURD



هەتاهەتایی لە لیدان کەوت.. و. لە هۆڵەندییەوە: حەمەی ئەحمەد رەسوول.

## مانی Manet 1832-1883

ئیدوارد مانێ/ لە سالی ١٨٣٢دا لە خیزانیکی هەژارو نەدار لە پاریس هاتۆتە دنیاوە و هەر لەویش ژیاوە، سالی ١٨٥٠ بۆ خزمەتی سەربازی بەرەو ئەمەریکای باشوور راپیچکراوە، پاش گەرانەوەی وەك خویندکاریك بریك وانەی هونەری سەبارەت بە شیوەکاری لەسەر دەستی تۆماس کۆوتوور ناویك فیربوو.. پاش ماوەیەکی کەم بە مەبەستی خۆقووتارکردن لەو ریبازە دیرنەی کە /کۆوتوور/ رەچاوی دەکرد) ژانرێ– genre (بە واتای؛ گەراندنەوە بۆ دەق و بابەتی میژوویی، کە بیگومان فۆرم و رەنگیش لەخۆدەگریت..! لەگەڵ ئەم وەرچەرخانەدا، باشترین و هەرە گرنگترین بریاریك کە بەجیی هینابیت لە ژیانی هونەریدا.

PDF 4 KURD



کە خۆی بۆ تەرخان کرد؛ بەوەی کە ڕێبازو ڕەوتیکی تایبەت بە خۆی بدۆزێتەوە بەوەی نەك تەنها ئاوریك لە رابردوو یان بابەتی دیرین بداتەوە، بەلکو چاکتر وابوو لەگەڵ گۆستاف کۆربێ/ Courbet G.[٢]دا ڕێچکەو قوتابخانەیەکی نوێ لە هونەری شیوەکاریدا دامەزرینن بە نیوی ریالیزم/ Realismەوە.

کارە هونەرییەکانی پیشووی مانێ لەژیر کاریگەری قوتابخانەیەکی هونەری ئیسپانیدا بوو لە سەرووی هەموویانەوە ڤیلاکویز/ Velaquez کە ئەوەش خەروارێك ئەزموونی هونەری پیبەخشیبوو، نەك تەنها لایەنی ئەو بابەتانەی فەراهەمی دەکردن؛ بەلکو لە بواری بەکارهینانی ڕەنگ و فۆرمیشدا.. لە سالی ١٨٦٣ تابلۆیەکی گەورەو سەرسامی ناردە ئاهەنگی سالأنەی/ سالۆن– Salon تابلۆکە بەم تایتلە ناوزەد کرابوو؛ Le dejeuner sur Lherbe بە واتای؛ فراڤینیك لە سیکس.. بەلأم دەمودەست تابلۆکە ڕەتکرایەوەو بەرەو/ سالۆنی ڕەتکراوەکان Salon de refuese یان برد، کە بریتبوو لە (گالیرییەکی گەورە گشت ئەو

PDF 4 KURD



تابلۆو کاره هونەریانەی ڕەزامەندی ئەنجوومەنی -سالۆن-یان بەدەست نەهینابوو.. لە شیوەی پیشانگایەکی یاساغدا نوومایش بە هونەردۆستان دەکران..[٣].

بەو پیودانگە، کاریکی هونەری، کاریکی مۆدیرن و هاوچەرختر بابەتەکانی سەردەمی رینیسانس لەدایکبوو، لە دووتویی تەکنیك و چلۆنایەتی دەربرین و بویری پیشاندانی لەش و گیانی ژنانی رووت بۆ یەکەمجار.. مقۆمقۆیەکی وەبەرو خەتەرناکی لە گۆرەپانی جیهانی هونەردا هینایە ئاراوە..

گۆمەکە بە تەواوی شلەقاو ئەو بیشەرمی و ریچکە شکاندنە (لەو سەردەمەدا) ناووناوبانگی بەم ریبازە بویرە نوییە بەخشی.

سالی ١٨٦٥ سەرلەنویٚ و جاریکی دیکە، کاری رچەشکاندن دووبارە بۆوە بەوەی کە تابلۆ بەناوبانگەکەی ئۆلۆمپیا Olympia کە فیگوری ڤینۆس (ی خوای جوانی و ئەوینی لای رۆمانیەکان/ و.)ی ڤینیسیای خەملاندبوو؛ بەوەی ژنیکی رووت و قووت لەسەر پیخەفیك

پالکــەوتووە، بــەڵام تیکــەل بــە ئەفســانەو میتۆلۆژیای تایبەت بە مانێ کە لە ئاتمۆسفیرو هەواو کەشی شیوزای گوزەرانی ئەو سەردەمەی خۆیدا جیگەیدەگرت.

لە ١٨٦٧ بەدواوە، ئەودەمەی پیشانگای هاوبەشی جیهانی ئیمپریشینزمەکان سازدرابوو مانێ ناووناوبانگیکی چاکی وەچنگ کەوتبوو، ئەو بە سەرەتاو دەستپیکی نەوەیەکی نوێ دەخەملینریت.. ئەو بە ئاسانی لە بواری -رەوتی ریالیزم لە هونەردا- پیش هەنگاوو شەقاوەکانی Courbet/ کۆربێ کەوتبوو، (بەو واتایەی سەردەمەکەی خۆی تیپەراندبوو/ و.).

مانێ، هەمیشەو هەرگیز ئەو بابەتە بەرجەستەکان و شتە هەستپیکراوەکانی دەوروبەری خۆی سەرلەنوێ بە شیواز و تەرزیکی تیکەل بە روانین و جیگەدەست و مۆرکی تایبەت بە خۆی دەنەخشاندنەوە.. تابلۆ ئالووالاکانی مانێ، بە هونەریکی روناك ویناد‌ەکرین کە لە ناواخندا بریتیبوون لە کەرنەڤالیکی چروپر لە

PDF 4 KURD



فۆرم و بابەت و فیگور، بە رەنگی جیاواز جیاواز دەینەخشاندن.. بەلاّم بە گشتی و تیکرا بەسەریەکەوە، کاریکی زۆر نەرمونیان و سیما ئال دەهاتنە بەرچاوی بینەر.

مانێ لە نەخشاندنی کارەکانیدا، بە پلەی یەکەم گرنگی بە فۆرم و بابەتەکان دەدا، نەوەك چوارچیوەی سکیچیك دابریژێ و تابلۆیەکی پیپربکاتەوە.. گرنگترینی شتیك ئەوەیە؛ مانێ، هەموو کەرەستەو بابەت و شیوازە کۆنەکانی نەوەی پیشخۆی وەلاناو ریچکەکەی بە تەواوی شکاندو وەك نویخوازو تازەگەریك ماناو واتایەکی نویی بۆ شیوەکاری ئافەریدە کرد، کە بابەتی زیندوو، بریقەو ورشەی رەنگەکان، چوست و چالاکی فیگورو فۆرمەکانی بوون.. کە مانای ژیان و جوولەیان بە فیگور دەبەخشی.

هەروەها لە دوا کاری هونەریدا کە لە سالاّنی دوواییی تەمەنیدا نەخشاندویتی بریتی بوو لە؛ ستیل لایف-یك" چەپکیك لە رووەکی هیلوون و لیمۆیەك (کە بە ئینگلیزی پییدەلین asparagus/ تامی لە باینجانی لای خۆمان دەچێ/ و.). بەلاّم

مانێ ئەو بابەتە چکۆلەو بێ جوولـەو سـادەیەی وەرگیراوەتە سەر کاریکی هونەری هیند گەورەو نایـاب کـە بـە دریژایـی رۆژانـی سـال بـە دەولەمەندیی فۆرم و بابەت و ئاهەنگیکی بەجۆش لە رەنگ و سیبەرو هیل و تۆنەکانی هەر بە نەمری دەمیننەوە..

مانێ لە تەمەنی ٥١ سالیداو سالی ١٨٨٣ لـە پـاریس کۆچبـار بـوو؛ ئەودەمـەش بـە رابـەرو پیشـەنگی سـەردەمەکەی خـۆی و مایسـترۆو مامۆستای قوتابخانەیەکی نویی جیهانی هونەری شیوەکاری لە قەلەم دەدرا..

PDF 4 KURD



## ئیدگار دیگاس Degas 1834-1917

لـه پـاریس لـه خـیزانیکی دەولەمـەندی بـە رەچەلەك سەر بە هەریمی ناپۆلی ئیتالیا جیرمەین ئیدگـار دیگـاس سـالی ١٨٣٤ لـەدایکبووە.. دیگـاس لـە بـواری هونـەری شـیوەکاریدا و بـۆ ئـەوەی مەبەسـتی نیگارکیشـی لا مەیسـەر بـێ، خولیکی فیربوونی وەرگرتووە، ئەو مامۆستایەی؛ کـە زۆر بـە قوولـی ئەشـق و نـەریت و Lamottie لەسەر دەستی مامۆستاکەی (لامۆتی) کەلەپووری بـاوو کلاسـیکیی بـەدیگاس بەخشـی، کـە لـە نیشـتمانەکەیەوە -واتـە ئیتالیـا– لەگـەڵ خۆیـدا هینابووی و لە هەگبەکەیدا پاراستبووی.

سـالی ١٨٥٦ لـە گەشـتەکەیدا بـەرەو ئیتالیـا ئاواتیکی دیرینـەی خۆی هینایـە دی بـەوەی کـە

PDF 4 KURD

کەوتـە خوێنـدن و لێتۆژینـەوە سـەبارەت بـە هونەرمـەندە کلاسـیکیە ناودارەکـان، بـۆ ئـەو مەبەسـتەش لەسـەر دەسـتی هـەردوو مەزنـە ماموّسـتا گـیرلاندایۆو ماتیگنـا Mantegna/ Ghirlandaio خولیکـی تایبـەتی راهینـان و فێربوونی جیبەجی کرد.. هەر بۆیەشە سەیر نییە کە کارە هونەرییە سەرەتاییەکانی دیگاس، جی پەنجەو ئاسەواری ئەو شێوازە دێرینـەیان پیـوە دیـارن و ئاویتـەن بـە رۆحـی نیگـاری کلاسـیکی نایاب.. کارەکان گەلیك قەشەگ و دلفرین بوون؛ بابەتـەکان لـە دووتویـی میتۆلۆژیـاو داسـتانە دیرۆکییەکانـەوە سـەریانهەلدابوو؛ لـە لایەکـەوە پرەنسـیپە ئاکادیمییـەکانی -نیگارکیشـان- ئـەو بابەتانـەی دەسـتەبەر دەکـردن کـە واقیعـی و میژوویـی بـوون، لـە لایـەکی دیکـەوە، خـەیال و ئەندیشـەی بـەرفراوان و گـەلی بابـەت و تیمـای تیکچـرژاو -بـەلام دیسـپلینکراو- لەیـەك تـابلۆدا کۆدەکردنەوە.. کـە ئەمـەش دەرەنجـام فاکتـەریك بـوو لـە وروژانـدن و خرۆشـاندنی ئەندیشـەو دەروونـی مـرۆڤ (بینـەر)دا، وەك ئـەوەی لـەو

PDF 4 KURD



تابلۆیـــەدا بـــەدی دەكـــرێ بـــەنیوی؛ دژواری و ئەشكەنجە لـە شاری ئۆرلییانسـەوە/ Het lijden van de stad Orleans كە سـالی ١٨٦٥ و لـە سالۆن بە هاوبەشی لەگەڵ مانێدا بە تابلۆی ئۆلیمپیا/ لە پیشـانگەیەكدا نومایشـیان كـرد، ئـەوەش دووا كارەكانی ئەو وچان و قۆناغە میژوویـە بوون لـە ژیانی دیگاسدا(٤).

لـەژیر كاریگـەری و بـە ئـاكتیڤی ئـەو گەنجـە فۆتۆگرافانــە و نیگــارو وینــە ژاپۆنیانـــەی لـــە پاریسـدا دەبیـنران گـەلیك جیـی سـەرنج بـوون و بالیان دەكیشایە سـەر گرنگی پیدان و ئارەزووی دیگاس، ئەمیان بەو ئاراستەدا دەبرد كە لە ژیانی هاوچـاخی خۆیـدا پـەی بـە شـتێ بـەریت كـە لەوەوپیش ئەو نهینیانەیان لـە روو دانەمالینراون و ئاشـكراكردن و هینانـەوە ئارایـان بـۆ جـاریكی دیكـــە.. ژیاندنـــەوەو ئافەریدەكردنـــەوەیان بـــە شـــیوەیەكی مۆدیـــرن جیگـــای سەرســـورمان و شایانی باسە، لەو بابەت و تیمانەش ((پیشبركیی ئەسپان– لـەنیو هـۆڵ و سالۆنی سـەمای بـالیدا)).. لـە نموونـەی ئـــەو تـــابلۆو كارانـــەش شـــوین و

پایەیەکی ئەوتۆیان بە دیگاس بەخشی هەر لە یەکەم پیشانگای هاوبەشی گروپەکەی ئیمپێرشینیزمەوە کە لە ساڵی ١٨٧٤ سازدرا.. چالاکانە تا دوا پیشانگای هاوبەشی هەر بە دڵسۆزی و دڵپاکی مایەوەو نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو لە ساڵی ١٨٨٦دا نوینەرو جیگریشیان بوو، ئافەریدەی نویشی ئەوە بوو کە فیگوررو لەشە رووتەکانی -نیو تابلۆکانی- بە بۆیەی پاستیل جیبەجێ دەکردن.

دیگاس سەرباری ئەوەش کە هیندە یەکدگیر و وابەستە بوو بە گروپەکەیەوە کەچی هەردەم خۆی وەکو کەسایەتیەکی گۆشەگیر رادەگرت، هەر بەوەشەدا ئاشکرایە، کە هەرگیز گرنگی بەو بابەت و مەسەلەیە نەدەدا کە گوایە ئەو جیگرو سەرکاری ئیمپریشیۆنیستەکان بێ..

لە رووی نیگارکیشی دەشتودەر لە هەواو کەشیکی کراوەدا، ئەو هەرگیز هەڵاویردی ئەوەی نەدەکرد کە رەنگەکان لە رووناکیدا پیویستە بلەرینەوەو ورشە ورشیانبی.. خولیاو ئارەزووی دیگاس هەمیشەو هەرگیز هەر لە چوارچیوەی

نەخشاندنی لەشـولار و فیگـوردا دەسـوورایەوە.. بـۆ ئیدگـار دیگـاس، بـە بابـەتکردنی فیگـوور بـە شیوەیەکی گشتی کاریکی هوشیارانەو بە سەلیقە بوو، بە تایبەتی لە ژینگەو کۆمەلگای هاوچاخ بە سەردەمەکەی خۆی کە گوزەرانی رۆژانەی خەلکی و جموجولی خەلکان بەکارکردنەوە ببووە شتیکی باوو رۆتینی.. لەو جموجول و چالاکییانـەی ئـەو سـەردەمەی ژنـانیش ئەمانـە بـوون.. کیژۆلـە سـەماکەرەکان، ژنـانی نیـو تـەوالیت و تیاترۆخانەکان، ئافرەتە ئوتوو لیدەرەکان..

دیگاس لـە نەخشـاندن و بـە تیمـاکردنی –بـە بابەتکردنی– ئەو فیگوورانـەدا، هـەر لـە شـیوەی راوچییـەك، بـیرو تیبینـی و روانینـی (هـەتا هەتـەرکا) بـە وردی و بـە دیقـەت دەخسـتە گـەر، سـەرەتا بـە بۆیـەی رۆنـی و پاشـان بـە پاسـتیل کارەکـەی تـەواو دەکـرد، شـایانی باسـە، بـۆ بەکارهینانی ئـەو تەکنیکـەش، دیگـاس گـەرابۆوە سـەر مـیراتی مامۆسـتا مەزنەکـەی –ئینگریـس/ ئەنگـەر Ingres ((کـە لـە راسـتیدا دیگـاس ئـەوەی نـەدرکاندبوو، ئاماژەشـی پینـەدابوو)). بـۆ ئـەو

تەکنیکە، لە هیلکارییەکانیدا بە شارەزاییەکی لە رادەبەدەرو کارسازییەکی بێ وینەوە مامەڵەی لەتەکدا دەکردن، هەمان تەکنیکی لە کارە پلاستیکییەکانیشدا بەکارهینابۆوە کە لە کۆتایی ژیانیدا نومایشیکردن و خستیە بەر دیدەو رووناکی..

ئیدگار دیگاس لە سالی ١٩١٧ و لە تەمەنی هەشتاو سێ سالیدا لە پاریس مالئاوایی لە ژین و دونیای هونەر کرد.

و. لە هۆلەندییەوە: حەمەی ئەحمەد رەسوول.

PDF 4 KURD



## سیسلی Sisly 1839-1899

ئـــالفرید سیســـلی، لـــه ســـالی ١٨٣٩ لـــه خیزانیکی به رەچەلەك ئینگلیز لـه شاری پـاریس لـه دایکبووه.. دایك و بـاوکی خانـەدان و زەنگـین بوون بۆیه کاریکی هاسان بوو هەموو کەلوپەلیکی کـارکردن و تـابلۆ نەخشـاندن بـه ئاسـانی بـۆ هەلدەسـوورا، سیسـلی خویندکـاریکی نیـو سـالۆنیکی هونـەری بـوو لـه شـاری گلـەیرێ/ Gleyre، لەو جیگایەی که سالی ١٨٦١ هەریەك له گـەورە هونەرمـەندانی وەك مۆنـێ Monet بـازیل/ Bazille و رینوار Renoirی ناسی که پاشتر بوونه هاوریی هەرە نزیکی یەکتر.

سـالی ١٨٦٦ یەکـەم پیشـانگای بـۆ کـارە هونەرییەکانی خۆی کردەوە، شەرو جەنگی نیوان

فەرەنساو ئەلمانیا (لە ١٨٧٠-١٨٧١)دا هەروەکو زۆربەی زۆری خەلکان، سەروەت و سامانی ئەمانیش گەلیك زیانی پیگەیشت، زەبری ئەو شەرە لە کەمدەرامەتی و کەمدەسکەوتی تابلۆ فرۆشتندا رەنگیدایەوە، کە وەکو بژیویکی سەرەکی بوو لە ژیانی سیسلیدا[٥].

لە سالی ١٨٧٤دا بەشداری لە یەکەمین پیشانگای هاوبەشی گالیری هونەرمەندانی ئیمپریشنیزمدا کرد.. دیمەنی جوان و قەشەنگی لادێ و گوندە قشتیلەکانی دەوروبەری پاریس هەمیشە سەرنجراکیش و خولیاو مەبەستی سیسلی بوون.. وەکو بالندەیەکی ئاشق بە گولزار هەردەم گۆرانی بۆ رەنگ و سروشتیکی کال و گۆنا ئال دەچری، ئەو خۆی چاکدەناسی لەو رووەوە کە چۆن مامەلە لەگەڵ بابەت و بەکارهینانی تۆنەکانی فلچە و رەنگدا دەکات، بەپیی میزاج و تیروانینی ئەو گەر ریژنەو باووبۆرانی لەمەر گوندی مارلی Marly بنەخشاندبایە، ئەوا فلچەو رەنگ لەژیر دەستی سیسلیدا زۆر

PDF 4 KURD

نەرمونیان.. ئال والاٚ.. رۆشنایی بە دیدەی بینەر دەبەخشی.

لە سالی ١٨٧٩ هەواری بەرەو لۆینگ/ Loing گواستەوە، ئەو هەوارەی گەلیك دلگیرو تیشکی خۆری لە ئامیز گرتبوو، ئەو جیگەیەی شادمانییەکی بیهاوتای پیدەبەخشی، ئەو جیگەیەی سەددەر سەد بۆ هونەر و هونەرمەندان خولقابوو.. سیسلی هەر لەو جیگە دلگیرەشدا لە ١٨٩٩داو بە نەناسراوی کۆچبار بوو.. هەر سێ مانگیك پاش کۆچی سیسلی، تابلۆکانی لە مەزاتیکی بەرفراواندا بە نرخیکی گرانبەها فرۆشران، بەوجۆرەش لە سەرانسەری ولاٚتەکەیدا ناوو ناوبانگی پەیداکرد.

و. لە هۆلەندییەوە: حەمەی ئەحمەد رەسوول.

## سیزان Cezanne 1839-1907

پۆل سیزان سـالی ١٨٣٩ لـه ئـایکس –ئیـن– پرۆڤینـس لـەدایکبووه، پـاش هاتنــه دنیـای بـه ماوەیـەکی کـەم و چاوەڕواننـەکراو، بـاوکی بـووه خـاوەن بـانك و سـامانیکی ئیجگـار زۆر.. لــه قوتابخانەیـەکی شـاری (ئـایکس) دەسـتی بـه خوینـدن کـردووەو هـەر لـەویش پیکـەوه لەگـەڵ نووسـەری نـاودار ئیمیـل زۆلادا خویندکـار و هاورییەکی زۆر نزیکی یەکتر بوون. پاش ئەوەی سالی ١٨٦٢ نوشوستی بەسـەر بـاری خویندنـی سیزاندا هات لە کۆلیـژی یاسادا، بـەرەو شـاری پـاریس کەوتـەری بـه مەبەسـتی ئـەوەی ببیتـه نیگارکیش، وەلی جاریکی دیکەش، بەدبـەختی و بیچارەیی رووی لـه دەرگـای مـالی سـیزان نـاو ئـەمجارەیان ئاکادیمیـای هونـەری؛ داواکـاری

PDF 4 KURD



وەرگرتنی سیزانیان رەتکردەوەو ئارەزوویان لە وەرگرتنی نەبوو..

سیزان، پاش هەولیکی بیووچان لە کارکردندا لەتەك باوکیا لە کاروباری بانکدا، بۆ ئەوەی مەیل و ئارەزوویەکی تیادا فەراهەم بێ، وەلی هەر بیهودە بوو، لە جارسی و بیزاری زیاتر چیدی وەچنگ نەکەوت.. بۆیە جاریکی دیکەو بە نیوەچلی کەلکەلەی گەشتیکی نوێ بەرەو پاریس دایەوە لە کەللەی گەنج سیزان.

سالی ١٨٦٣ ئیمیل زۆلای هاوری و نووسەری لە پاریس بینی، کە گەلی هاریو رینوومایی پیشکەش بە سیزان کرد، بە تایبەت لەو بوارەوە کە پیوست بوو سیزان ریچکەو ریبازیکی هونەریی سەر بە خودی خۆی وەدۆزیتەوە.. ئەو بە دەم خولیاو ئەندیشەی قوتابخانەی رۆمانتیکەوە دەستی بەکار کرد.. بەلام زۆلا هەر خیراو دەستبەجێ پەیوەندی سیزانی بە /مانێ/وە گریدا. تیکرا هەموو مەبەستیکی؛ بەهرەو ئیلهامیکی ویژەیی و زەمینەی تیفکرینی سیزان راستەوخۆ بەرەو یەك ئامانج و ئاوات ملی

ریبدەنا کە ئەو ئاواتەش؛ بیگومان، نیگارکیشی بوو..!

لە سالی ١٨٧٣دا سیزان وەك خویندکاریکی بە سەلیقەو لیهاتووی پیسارۆ، گەلیك رینومایی و وانەی بە سودی چنگ کەوت و هیدی هیدی چووە سەر ریگای ئیمپریشینیزم و بە جۆشەوە لە تەکنیك و تیگەو نیگای تایبەتمەند بەو رەوتە سەرقال ببوو.. سالی پاشتر وەك ئەندامیك لە پیشانگای تایبەت بە گروپگەری ئیمپریشیونیستەکاندا تابلۆو کارەکانی بۆ یەکەمین جاری ژیانی نومایش کرد.. لە سالی ١٨٧٧یشدا، لە پیشانگای سییەمی ئەو گروپەدا کارەکانی سیزان دووچاری وەیشوومیکی دژوار بوون و رووبەرووی نارەزاییەکی توندی زۆربەی خەلکان بوونەوە.. سیزان، لەپای ئەو فشارە ناهەموارەداو رەخنەی هەمەجۆردا، بە تەواوی شکستی هینا، ئەو رەخنەو پلارانەی لە ناوەوەو دەرەوەی ولاتەکەیدا ئاراستەی دەبوونەوەو بە تەواویش تەرکیز و جەختیان لەسەر کارەکانی سیزان بوو..!

هەر لـە سـالى ١٨٨٦ەوەو سـەراپاى تەمـەنى ژيانى لە شارەكەى خۆيدا -ئايكس- دەگوزەراند، رەنگـە دەرئـەنجامى ئـەوەش بووبـێ كـە؛ لـەپاش مردنى دايك و باوكى، مال و مولك و ميراتيەكەيان سـيزانيان ناچـار كـرد بـە مانـەوەو لـە هـەمان كاتيشـدا پاداشـتێ بـوو كـە ئيـدى مشـتێ لـە خـەرمانى گريكويـرەى نـەدارى و كەمدەرامـەتى ئەميش بكريتەوە.. رەنگە ئەوەش بووبى كە هانى دەدا رۆژانە سەرقالى كاركردن بووبێ..

سـيزان، سـالى ١٩٠٦ لـە گەرمـەى كـاركرندا كۆچى دوايى كرد، پاش ساليك لە پيشانگايەكى تايبەت بە بيرەوەرى سيزاندا ئەوە دووپات بۆوە كـە؛ كارەكـانى لـە دەلاقـەى كـازيوەى سـەدەى بيسـتەمەوە سـەريان دەرهينـاو جـى پەنجـەو ئاكتيڤ و كاريگـەرى ئەوتۆى ئيشـەكانى سـيزان ئاشكراو راشكاوانە ديارن، تـۆ بروانـە كـە چـۆن (كۆبيـزم- Kibisme)(٦) لـە هـەناوو دووتويـى ئـەو كارە نەمرانەوە سەريانهەلداو خەملين.

سـيزان، لـەنيو ئيمپريشيۆنيسـتاندا لـە هـەموويان توورەتـر بـوو، پيدەچـێ، لەبـەر ئـەوە

بووبێ کە هەندێ شتی چاوەروان نەکراو و پیچەوانە بە میزاجی ئەو دەقەومان، جا بۆیە هەر سەردەمیکیش دوور بوو لە گروپەکەی و چالاکییەکانی..

سیزان، لە کانگەی راستەقینەوە بابەت و نیگاری بۆ بەرهەمەکانی فەراهەم دەکردن.. بە دریژایی ئەو ماوەیەی کارە هونەرییەکانی لە مۆزەدا بوون، جیگەی سەرسورمان و سەرسامی هەموو لایەك بوون. ئەو کاری لەسەر ئەوە دەکرد، ریسایەکانی دیرینی ئیمپریشینیزم وەلانێ و.. تەنها بە چاوی -کامیرا ئاسا- ببینیت و لە هەستتدا بخەملێ بگۆرێ و بەرەو ئەو ئاراستەیە وەرچەرخێ کە بریتی بێ لە؛ "بە چاوانت بیربکەرەوە- یان باشتر بلیین؛ بیرکردنەوە لە میانەی چاوەوە)).. ئیدی تۆن و هیلەکان ریچکەی خۆیان دەگرن و بناغەیەکی بەهیز بۆ رەنگرشتنی کاری هونەری مەیسەر دەبێ، کە بە شیوەیەکی هاوسەنگ و بالا گرتوو ئەوجا رەنگەکان ئاهەنگیکی لەسەرخۆی هارمۆنی سازدەکەن، کە بە رای سیزان پیویست وابوو، رەنگەکان؛ کورو

PDF 4 KURD



نـەوەی راسـتەقینەی سروشـت بـن و کتومـت لــە دەشت و دەربچن..

لــەو لایەنــەوەش کــە ســیزان کــارو بابــەت و نیگاری هونـەری نویـی ئافەریدە دەکـردن، کـە بـە شیوەیەکی ئەوتۆ مۆرکی خودی خۆی پیوە بوو..
هـــەر ئـــەوەش بـــوو ناوبانگییـــەکی بیـــهاوتای پیبەخشیبوو کە زیـاتر لـە ئیمپریشـینیزم خـۆی دەنگیـدا بـۆوە، بــە کورتــی تــابلۆ رەنگینــەکانی سیزان خۆیان دەروازەی سەدەی بیستەمیان لەخۆ کردبـۆوەو سـلاویان لـە سـپیدەی چـەرخی نـویَ دەکرد.

PDF 4 KURD



## مۆنیێ★ Monet

مۆنـــــێ Monet: لــــه لی هارڤـــــێ LeHarve لــــەدایکبووەو گـــەنجیتی بەســــەربردووە، لــــە نەوجوانیـەوە دەسـتی کـردووە بـە نیگارکیشـان، کارەکانی جیی سەرنج و بەدلبوونی بۆ دان بووە، هـەر بۆیـە لەگـەڵ خۆیـدا بـۆ نیگارکیشـانی لـە سروشـتی کـراوە بانگهیشـتی کـردووە، پیکـەوە دیمەنی سروشـتی کـەنارە بەردینـەکانی سـاینت ئەدریسە Saint- Adresse یان نیگارکیش کـردووە، ئیدی لەو ساتەوە کلاود مۆنێ بوو بە نیگارکیشی ئاسمان و روناکی و دیمەنی سروشتی.

لـە نۆزدە سالیەوە چووە بـۆ پـاریس و لـەوێ پیسارۆی نیگارکیشی ناسیووە، لـەپاش خزمـەتی سەربازی لە جەزائیر سالی ١٨٦٢ گەراوەتـەوە بۆ

پاریس و لەوێ چەندەها نیگارکیشی لاوی لە ستۆدیۆی گلیر Gleyres Studio وەك رینوار، سیسلی، بازیلی ناسیوە، هەر لە هەمان سالدا بوو کە مۆنێ جاریکی دیکە کەوتەوە نیگارکیشانی دیمەنە سروشتیەکان، بەلام ئەم جارەیان لەگەل بۆدان و جیوکیند Jonkind، ئەم دووانە سەرنجی مۆنییان بۆ گۆرانکاریەکانی روناکی و تیشك لە کەشیکی شیداردا راکیشا، دیارە کاری پیکەوەیی کۆربێ و مۆنی لە سالەکانی بەدواهاتووەکاندا، فیگورە مەزنەکانی ئەو هاوئاهەنگی و کۆمپۆزیسیۆنی کارکردنیان لە سروشتی سەربەستدا نیشاندا کە مۆنێ کاری لەسەر کردبوو.

لە کاتی جەنگی ١٨٧٠دا مۆنێ بەرەو لەندەن سەفەری کرد، لەوێ زۆر کاری هونەرمەندە سروشتیە ئینگلیزەکانی بینی بە تایبەت کارەکانی کۆنستابل و تیرنەر Constael and Turner، لە سەفەری هۆلەندەشیدا کەنالە ئاویەکان (بە تایبەت کەنالە ئاویەکانی تساندام Zaandam) ئەم دوو سەفەرە

PDF 4 KURD



کاریگەرییەکی بریاردەری لەسەر کارەکانی داهاتووی مۆنێ بەجیهیشت.

لە ١٨٧٢دا تابلۆیەکی تەواوکردو ناونیشانی Impression, soleil levant لە خۆرهەڵاتن روانین–ی بۆ دانا، ئەو نیونیشانە بووە کۆنسیپت و نەخشەی داهاتووی ڕیرەوی هونەری ئیمپریشینستەکان و خالی نیوزەدکردن و نیولینانیان. ئیدی لە چەند مانگی داهاتوودا مۆنێ بە تابلۆ لەدوای تابلۆکیشان لە ئارگینتۆیل قەدەری خۆی وەك هونەرمەندی دیمەنی سروشتی دریژە پیدا، سەفەرەکانی پالیتی رەنگی نیگارکیشان و بابەتەکانی فراوانتر کرد، لەم سەفەرانەیدا جوانی و دیمەنسازی کاریگەری جۆری ژیانی شارەکانی لا ئاشکرا کردبوو.

گومانیشی تیدا نییە کە مۆنێ هیرشی رەخنەیی زۆری کراوەتە سەر، بەڵام لە دوای ئەم هەموو هیرشانە توانی لە سالی ١٨٨٩ جۆریك لە دانپیدان بە هونەرەکەیدا ببچرێ، لەو کاتەوە ئەو دەستی کرد بە کارکردن لە پرۆژەیەکی نویدا، ئەو پرۆژەیە بریتی بوو لە چەند کاریکی دراسی

لەسەر یەك بابەت، لە پێناو دەرخستنی کاریگەری تیشکی خۆر لە چەند کاتیکی جیاوازدا لەسەر دیمەن یاوەکو بابەتیکی دیاریکراو، لە پیناو ئەمەشدا لە زەردەی بەیانەوە تاوەکو بۆلیلی ئیوارە هەمان دیمەنی چەند جاریك و لە کاتی جودا نیگارکیشکرد، چەند کاتیکی جیاوازی لە هەمان رۆژدا هەلبژارد کە گۆرانکاریەکانی تیشکی خۆر بە تەواوی نیشانبدات، ئەمە زنجیرە تابلۆیەکی گرنگی مۆنێ بوو لەمەر گۆرانە جیاوازەکانی تیشکی خۆر.

دوا ترۆپکی شاکاری هونەریشی زنجیرەیەك تابلۆی ئاوی مۆر بوو، کە لە کۆتایی تەمەنیدا لە گیڤیرنی Giverny نیگارکیشی کردبوو،(٧) مۆنێ لە ریکەوتی ١٩٢٦ لە گیڤیرنی کۆچی دوایی کرد.

بەم جۆرە مۆنێ ئیمپریشنستیکی دامەزرینەرو سەرەتا بووە، پسپۆرو وەستای روناکی هەلأیساو و رۆشناییەکانی رەنگ بوو، چاوە هەستیارەکانی جوانترین ئاستەکانی رەنگی دیمەنی سروشتی نیشاندا، کە هیچ چاویك لەوەوبەر نەگەیشتبووە ئەو ئاستە بالأیە.

PDF 4 KURD



و. لە ئەڵمانییەوە: ئیسماعیل حەمە ئەمین.

## مۆریسۆ ١٨٤١-١٨٩٥ Morisot

بیرتێ مۆریسۆ Berthe Morisot لە ساڵی ١٨٤١ لە شاری بۆرجێ لە فەرەنسا لەدایکبووە، کچی کابرایەکی دەوڵەمەند بووە. باوکی سەرپەرشتیاری بەشێکی سەر بە وەزارەتی بەڕیوەبردن بووە.. مۆریسۆ هێشتا منداڵ بووە کاتێ خێزانەکەی بەرەو پاریس گواستوویانەتەوە، هەر لەویش بیرتێ و خوشکەکەی دەخرێنە بەر خوێندن و خولێکی تایبەت بە فێربوون؛ لە بواری نیگارکێشی و وێنە نەخشاندندا تەواو دەکەن.

کاتێ تەمەنی بیرتێ گەیشتە بیستو یەکساڵی، بۆ یەکەمجار نیگارکێشی بەناوبانگی ئەو سەردەمەی خۆی ناسی کە کۆرۆ Corot بوو.. هەر

کۆرۆشــبوو کــە بــەهرەو ســەلیقەی مۆریســۆی هەلســەنگاندو کارەکــانی خســتە بــەر تیشــکی رانانــەوە.. هــەر ئــەویش یــەکێك لــە هاوەلــەکانی خــۆی کــە نــاوی ئۆودینــۆ Oudinot بــوو وەك مامۆسـتایەك بـۆ تـەرخانکرد تـاوەکو وانـەکانی فێربوونی نیگارکێشی پێ بلێتەوە، لە مۆزەخانەی لۆڤــەردا، هــەردوو خوشــکانی مۆریســۆ هونەرمەندێکی لاویـان ناسـی کـە وەختـی خـۆی تابلۆکانی ئـەویان کۆپیـە ئـەکردەوە، ئـەو لاوەش هونەرمەندی ئایندەی ناودار ئێدوارد مانێ Manet بـوو.. شـێوازە نوێکارییەکـەی کەلـە تابلۆکـانیدا بەرجەسـتەی دەکـردن لـە مێشـکی بـێرتیی کچـە هونەرمەندا بە چەشنی خولیاو تێرامانێکی ئـەوتۆ رەنگـی دابـۆوە کـە هـەر ئەمـەش بـووە فاکتـەرو هاندەرێك کە مۆریسۆ لەو کلاورۆژنەیەوە رێچکەی هونەری بە خودی خۆی بدۆزێتـەوە.. لە لایەکەوە بـیروراوبۆچوونی مانـێ و لـە لایـەکی دیکــەوە، بەکارهێنانی تـەکنیکی جیاجیای نێـو تابلۆکـانی، هــەتا دەهــات ئاکتیڤیــان لەســەر مۆریســۆ زیــتر دەبــوو.. هــەر بــۆ نموونــە؛ لــە تــابلۆی

PDF 4 KURD



بـــالكۆن –هـــەیوان/ Balconی ســـالی ١٨٦٨داو كـــارە هونەرییـــەكانی پاشـــتریش كـــە تیایـــاندا مۆریســـۆ خـــۆی وەك مۆدیـــل و پۆرتریـــت دەنەخشاند..

لە سالی ١٨٧٤ەوە تا دەهات پەیوەندی نیوان ئەم كچە نیگاركیشە و ئۆوژیـن بـرا بچووكەكـەی مانێ بەرەو پتەوی دەچوو تا لـە ئاكـامدا بوونـە هاوسـەری یـەكدی. سـەرباری كاریگـەری بـەهیزی مانێ بەسەر كارەكانی مۆریسۆوە، كەچی شیوازو سـتایلی خـودی خـۆی گەشـەی دەسـەند و بەرەوپیش هەنگاویان دەنا.. كارەكانی مۆریسـۆ بـەوە وینـا دەكـران و لـە خەسـلەتە گرنگـەكانی؛ ناسكی و ئالووالآیی روناكی، رەنگ، بوون، كـە لـە ئەزموون و مۆركی تایبەت بە هەواو ئاتمۆسفیری دونیاو ژینگەی بە خۆی ئاشناو هۆگـر ئافەریدەو خـەملأبوون.. كـە ئەمـەش زۆر بـە راشـكاوی لـە تابلۆی جۆلانە/ De wieg – سـالی ١٨٧٣دا بـەدی دەكـرا.. بیرتـێ مۆریسـۆ هـەر لـە سـەرەتاوە هاریكـارو بەشـدار بـووە لـە رەوتـی نویكـاری و تازەگـەریتی ئیمپیریشینسـتەكاندا، ئـەم ژنـە

نیگارکیشـه بەرهـەم بـەپیزە، تـا دووا پیشـانگای هاوبەشی گروپەکە، بە واتای هـەتا سالی ١٨٨٦ داهینەرانەو وەك هونەرمەندیکی راستەقینە لەتەك ریبازی ئیمپریشینیزمدا خزمەتگوزار بووە. هـەتا دلە گەورەکەی لە سالی ١٨٩٥ لە پاریس لە لیدان کـەوت و بـۆ یەکـەمجاری مالئـاوایی لـە ژیـان و هونەر کرد.

و. لە هۆلەندییەوە: حەمەی ئەحمەد رەسوول

PDF 4 KURD



## رینوار Renoir

رینــوار Renoir: پــیریی ئۆگیســت رینــوار لــە ساڵی ١٨٤١ لە لیمۆگیس Limoges لەدایك بووە، باوکی بـەرگدروو بـووەو لـە پینـاو پاشـەرۆژیکی باشــتر بــۆ خیزانەکــەی گواســتوویانەتەوە بــۆ پاریس، لەوێ رینوار لە تەمەنی سیازدە ساڵانیدا لـە کارگەیـەکی کاشـی و کـاری سـیرامیك کـاری کردووە، بەڵام کارکردن بەو شیوە میکانیکیە لـە کارگەیـەکدا وای لیکـردووە بـیزار بیـت و بـەدوای کاریکی دیکەدا بگەریت.

لـیرە بوونیکـی چـاوەروانکراو لـە ریگەیـەوە بوونــی خــۆی بســەلمینێ، لــە بونــی بــوو بــە خویندکار لە ستۆدیۆی گلیر Gleeyerدا بینیەوە، ئەم بوونی بە خویندکارە لـە پینـاوی فـیربوونی

هونەری نیگارکیشـان و پیشـەیەکی دوارۆژ بـوو، لەویّ لە سالی ١٨٦١دا مۆنێ و بازیلی و سیسلی ناسـی، ئایدیاو بیرە رۆشنەکانی ئەم نیگارکیشـە مەزنانـە ریرەویکـی نوییـان بـە هونەرەکـەی بەخشـی. لـە سـالی ١٨٦٤ بەشـداری لـە سـالۆن Salonدا کـرد بـە تابلۆیـەك کـە هیشـتا سـتایلی رۆمانسـیەتی تیـدا بـەدی دەکـرا، بـەلام دوای سـالیکی دیکـە بـە دوو تـابلۆی زەیتـی دیمـەنی سرووشـتی لـە هـەمان پیشـانگادا بەشـداری کـرد. بـالاترین خـالی پیگەیشـتنی رینـوار ئـەم سـورە هونەرە تایبەتەی، لە تابلۆیەکی گەورەی کیژیکـی قەشەنگدا بە روونی هەستی پیدەکرا، پۆرتریتـی کیژیکی قەشەنگ لەنیو دارستاندا، لیسیّ Lise(٨)، لەو تابلۆیەدا رینوار پەیوەندیەکی خۆشنودانەی نیوان فۆرم و روناکی پیکەوە گریدابوو، بەلام بە داخەوە جەنگی سالی ١٨٧١ بۆ ماوەیەکی کورت ئەو سورە هونەریەی پیبری، لە دوای ئـەو مـاوە کورتە پـەیوەندی کـرد بـە ئیمپریشینسـتەکانەوە لەگەلیاندا بـە تابلۆیـەك بەشـداری لـە پیشـانگای ١٨٧٤دا کرد. ئەو تابلۆیە نیوی ژورۆچکە/ کابینە

PDF 4 KURD



بوو Die Loge، لەم تابلۆیەدا حەزی رینواری بۆ فیگور نیشان دەدا. لە پیشانگایەکی دیکەی ئیمپریشینستەکاندا بە زنجیرەیەك تابلۆی زەیتی بەشداری کرد، لەم تابلۆیانەدا هەموو جەوهەری توخمە بنچینیەکان لەسەر جلوبەرگە کالەکان لە یاری روناکیدا خۆیان نیشاندەدا، تەنانەت سیبەرەکانیش پربوون لە رەنگ و تابلۆکان تیرۆژە روناکی لەرزیوی سەر رووبەری تابلۆکان بوون. لەگەڵ ئەوەی رینوار لە سالی ١٨٧٩دا دوو پۆرتریتی لە سالۆن نیشانداو جیگەی رەزامەندی بواری کراوەی هونەری بوون، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا ئەم تەکنیکە بالاّیە زۆر تورەیی هونەردۆستانی ئەو کاتەی وروژاند، لەو سالاّنەدا بەردەوام سەرنجتیژی -الترکیز- خستە سەر کار کردن لەسەر فیگورەکان و چیتر کارەکانی خۆی لەگەڵ ئیمپریشینستەکان نیشان نەدەدا. لە سالی ١٨٨٢ جاریکی دیکە لەگەڵ گروپی ئیمپریشینستەکاندا بەشداری کرد بە تابلۆیەك بەناوی -نانخواردنی بەیانی سەول لیدەریك Fruhstuek der Ruderer-، تابلۆیەك سەرکەوتن و

PDF 4 KURD

بالآیی ئیمپریشینستەکانی راگەیاند. لە هەشتا سالیدا رینوار گەرایەوە بۆ کارکردن لەسەر فۆرمە جیگیرەکان، ئەوانەی لە زۆر جاردا بووبوون بە قوربانی یاریی روناکی ئیمپریشینستەکان. لە دوایدا رینوار بە تەواوی بووە پسپۆریکی شارەزای پۆرتریت و فیگور[٩]، دوای بازدانی بەسەر سەدەی نۆزدەهەمدا، کەوتە نیگارکیشانی ژیانە راوەستاوەکان -ستیل لایڤ- و ئەکتە جۆراوجۆرەکان، کە تیدا جاریکی دیکە فۆرمی لە پیش روناکی و ئەتمۆسفیرەیەدا بالآدەست کرد، بە هەمان شیوەش لە سالآنی دوایدا شیوازو مۆدیل و پەیکەرەکانی لە هەمان ریچکەدا خۆی دۆزیەوە.

رینوار سالی ١٩١٩ لە کانگیس Canges گیانی سپارد.

گەر لە پیگەیشتنی داهینانی ئەم هونەرمەندە وردبینەوە، ئەو رۆژانە ژیانە دەبینین کە پیکەوە لەگەڵ هاوریٚ ئیمپریشینستەکانی دۆزیانەوەو وەك هونەریکی پیوانەیی بابەت مامەلەیان لەگەلدا

کرد، لیرەوە دەتوانین بلیین کە رینوار نیگارکیشی سافی و روونی ژیانی رۆژانە بوو[١٠].

و. لە ئەلمانیەوە: ئیسماعیل حەمە ئەمین

## کاسات ١٨٤٥-١٩٢٧ Cassatt

ماری کاسات لە ١٨٤٥دا لە پیتسبورگ/ Pittsburgی سەر بە شاری فیرنیژد چاوی بە دنیا هەلهیناوە، بەپیی ئەم بەروارەش بە یەکیك لە نەوەی نیگارکیشە ئیمپریشیزمیەکان لە قەلەم دەدریت، سالی ١٨٧٠ خویندنی سەبارەت بە هونەری نیگارکیشان لە پاریس تەواو کرد، هەر لەویش هیدی هیدی کەوتە ژیر کاریگەری هونەری نیگارکیشانی هاوتەمەن و هاوچاخی خۆیەوە.. لە ١٨٧٩دا بۆ یەکەمجار کارە هونەرییەکانی خۆی لە پیشانگایەکی هاوبەشی ئیمپریشینستەکاندا نومایش کرد، کە وەکو قوتابیەکی زۆر لیهاتووی دیگاسی هونەرمەندەوە

هاتە پیشەوەو جی پەنجەو مۆرکی خۆی بە بەردەوامی لە پیشانگا هاوبەشەکانی ئەو گروپەدا لە سالەکانی 86-1881-1880دا ئامادەو ئاشکرا بووە.. وەلی هەر کاریگەری دیگاس لە شیوازو ستایلی تابلۆکانیدا هەستپیکراوبوو؛ لە کارەکانیدا دارشتنی راستەهیلی فەراهەم دەبوو، کە ئەوەش بەوپەری جیی رەزامەندییەوە لە دیگاسەوە وەریگرتبوو.

لەپای پەیوەندیکردنی کاساتەوە بە ئیمپریشینستەکانەوەو شیوازو خەسلەتی رەنگی کارەکانی رۆشناییەك بەرپا بوو؛ چونکی رەنگی ئالو والاو کامل و نەشکاوەی دەنەخشاند..

لە راستیدا کاسات لە دارشتنی هیل و تۆنەکاندا بالادەست بوو، کە تا رادەیەکیش هاوشیوە دەبوونەوە دەگەڵ کارە هونەرییەکانی دیگاسدا، کە پیکەوەش (واتە؛ کارە هونەرییەکانی کاسات و دیگاس/ و.) لە خانەیەکی تایبەتی نیو گروپەکەدا دەخەملینریت.

بەلام کارو ئەفراندنە گرافیکیەکانی کاسات شتیکی دیکە بوون و تەواو جیابوون، کاریکی

PDF 4 KURD



یەك بەدوای یەك و زنجیرە گەلأیەكی گرافیكی بوون، كە زۆربەیان وشك كراوە بوون، بە تەكنیكی دەرزی چنین و زۆر بە وردی رەنگین نەخشێنیرابوون.. ئۆبژێك و بابەتی كارە هونەرییەكانی كاسات؛ لە ئاقاری شێوازی گوزەران و مامەلەی ئافرەت لەگەلْ ژیانیاندا، دەسورایەوە، بۆ وینە؛ دایك و كۆرپەكەی، گەرمی لە ئامیزگرتن و راموسانی.. كاسات لە هاریكاریكردن و بەشداربوونیشیدا لە ئابوونە كۆكردنەوەدا رۆلی گرنگی خۆی بینیوە بۆوەی هونەری گروپەكەی تەنانەت لە ولأتیكی وەك ئامەریكاشدا دەروازەیەكی لیوالأ بكریتەوە..

ماری كاسات لە لی میسنل- تیریبو Le Mesnil- Therbus سالی ١٩٢٧ كۆچبار بووەو بۆ دواجار مالئاوایی لە گروپەكەی و دونیای هونەر كردووە.

و. لە هۆلەندییەوە: حەمەی ئەحمەد رەسوول

## گۆگان ١٨٤٨-١٩٠٣ Gauguin

ئۆژین هینری پۆل گۆگان سالی ١٨٤٨ لە پاریس لەدایکبووە، لە هەرەتی هەرزەو لاویتیدا بە خزمەتگوزاری نیو کەشتی و ئەوجا بە کەشتییەوانیەوە خەریکبووە.. پاشتر وەك فەرمانبەری بانك و دواتریش بۆتە دەلاڵ و بە گۆرینەوەی دراوو پارە بژیوی خۆی وەچنگ هیناوە.. بەلاّم مەشق و راهینانی خۆی لە بواری نیگارکیشی هونەردا جیی شادمانی و رەزامەندی گۆگان بووە، سەرەتا پیسارۆ مامۆستاو راهینەری بووە، هەر ئەویش ریخۆشکەرو داخواز بووە لە بەشداریکردنی گۆگاندا لە نوومایشکردنی تابلۆکانیدا بۆ

PDF 4 KURD



یەکەمجار لە تەك هونەرمەندانی پیشانگای هاوبەشییان بوو کە سالی ١٨٨٠ لە پاریسدا سازدرا.

گۆگان لەوەدا کە وەك موریدو شاگردیکی پیسارۆ هاتە نیو گۆرەپانی نیگارکیشییەوە، بەلأم تەواو گەشەی دەکردو خیراو بەلەز وەکو سیبەرو سایەیەکی پیسارۆ لەرەو پیش دەچوو.. لەو سالأنەشدا قەیران و تەنگژەی چالاکی ئیمپریشینیزم لە ئارادا بوو، گۆگان لە ریچکەیەکی نوێ دەگەرا تا لە سروشت و -جیهانی دەشتودەر-ی نزیك بکاتەوە، لەو رووەشەوە هەمیشەو هەردەم لە کۆششدا بوو؛ کەرەستەو بابەتەکان بە سانایی و ساکاری لەنیو سروشتدا وینا بکاو بنەخشینێ، ئەمەش یەکەم هەنگاوی بادانەوەی گۆگان بوو.. (بۆ ریبازو ریچکەی نیو ئامیزی سروشت/ و.).

گۆگان لە ١٨٨٦ەوە بەدواوە، چووە بەریتانیاو لەوێ لەگەل بەرنارد/ Bernard و چامایلارد/ Chamaillard و سیگین/ Seguin قوتابخانەی پۆنت- ئاڤین/ Pont Avenیان

PDF 4 KURD



دامەزراند؛ شیوازو ستایلی ئەم گروپەش بەوە وینادەکرا کە رووبەریکی تەختوپان، وەك دەشتی کاکی بە کاکی، رەنگ تیایدا سەربەستەو بەبێ شکانەوە ریبگریتە بەر و تیکەل بە سانایی و ساکاری لە هیلیکی راسترەودا، وەك تۆناتی نەخشی سەر فافۆن یان شووشە (لە شیوەی تابلۆ و نەخشەی سەر پەنجەرەکانی نیو کلیساکان/ و.)..

پاش ئەو ماوەیەی کە لە بەریتانیادا بەسەری برد، بۆ گەشتیکی کورت بەرەو مارتینیك/ Marti nique چوو، ئەو جیگەیەی کە کەرەستەی نویی سروشتی تیا بەکارهینا، لەوانە؛ پیستە لە جیاتی خام و کاغەز.. میوەو گوشراوی میوە لە جیاتی رەنگ و زەیت. سالی ١٨٨٧ ماوەیەکی کەم لە پاریس و ئەوجا بەرەو ئارلیس/ Arles کەوتەرێ، لەوێ پاش چەند مانگیك کەوتە تەنگانەوەو پەیوەندی لەگەڵ فینسینت ڤانکوخ/ Van Goghدا پەیدا کردو لە خانووە زەردە بچووکەکەی کە ڤانکوخ بە کریی گرتبوو گۆگانی وەك میوان لای خۆی گل دایەوە.. وەلی ئەو پیکەوە ژیانە، لە

PDF 4 KURD



کریسمیس و کۆتایی سالی ١٨٨٨دا شکستی هیناو به دەمەقالێ و شەریك کۆتایی پیهات، لەو دەمەشەوە ئیدی نەخۆشیە نەفرەتەکەی ڤانکوخ دەستی پیکرد.

گۆگان دووبارە بەرەو بەریتانیا گەرایەوە، بەلاٚم ئەمجارەیان لە خولیاو پەرۆشیەکی قوولەوە بۆ دووتویی سەربەخۆیی و رەسانەیەتی (لە دۆزینەوەی مۆرکی تایبەتی بەخۆی و دوورگەیەکی تەریکدا/ و.).. لەپای بیزراوی و قیزلیهاتنەوەی گۆگان لە ژیاری ئەوروپادا، سالی ١٨٩٠ بەرەو دوورگەیەکی -تاهیتی- گەشتیکی دریژی کرد.. ئیدی لەو بەروارە بەدواوەو دووا سالاٚنی ژیانی لەوێ بردە سەر -ئەو دوو سالی نیوان ١٨٩٢-١٨٩٣ نەبیت کە بەرەو پاریس گەرابۆوە لە ١٩٠٢دا بۆ دواجار بەرەو دوورگەکانی (ماركیز/ Marquises) مالی گواستەوەو هەر لە یەکێ لەو دوورگانەدا بە ناوی هیفا-هۆدا/ Hoa -Hiva سالی ١٩٠٣ بۆ هەتاهەتایی کۆچی دوایی کرد[١١].

PDF 4 KURD



ئـەو سـكیچ و تابلۆیانـەی لـەو دوورگانـــەدا دەینەخشاندن مۆركی تایبەتی جیاوازیان هەبوو لە ساكاری شیوەو فۆرم نیشـانداندا، زیـاتر لـەو ماوەیـــەدا ئـــاكتیڤ و كاریگـــەری هونـــەری ئارابیسـكی/ عـەرەبی، بـە ئاشـكرایی دیـار بـووە بەسەر تیكەلكردن و ئاویتەسازیی هارمۆنی نیوان رەنـگ و هیلـــی بـــەكارهینراو لـــە بابەتـــەكاندا.. گۆگان، هەموو كەرەستەو ئامیریكی بۆ مەبەستی بەرهەمهینانی داهینانەكانی خستنەگەر بۆ كاری ئاویتەسـازی هونـەری؛ ئاویتەیـەكی مۆسـیقی و هـــارمۆنی بـــەرپاكرد لـــە هاوتـــاكردن و بەرابـــەر راگرتنـی هـیزو توانـای دەربریـن لـە لایەكـەوەو، ئەندیشەو خولیای دلگیرو دلفرین بەرجستەكردن لە لایەكی ترەوە..

شـایانی باسـە، گۆگـان زۆربـەی هـەرە زۆری فیگـورو شـــیوەكانی -نموونـــەن لـــە هونـــەری رۆژهەلاتـی دیریـن- كـە بـە قـەرز وەریدەگرتـن و لـە جیـــهان و ئاتمۆسـفیری تایبـــەت بـــە ســـتایل و ریچكەو تیماكانی خۆیدا ئافەریدەی دەكردن، كە لیرەشـدا بـە ئاشـكرایی و راشـكاویی كاریگـەری

PDF 4 KURD



**ئەوتۆی گۆگان بەدیاردەکەویت کە لە ڕێبازی ڕووتەنی (ئابستراکت/ Abstractie)ی سەدەی بیستەمدا سەری هەلدا..**

**و. لە هۆلەندییەوە: حەمەی ئەحمەد ڕەسوول**

## ڤینسینت ڤانکوخ
## Vincent Van Gogh

**ڤینسینت ڤانکوخ** Vincent Van Gogh: **لە سالی ١٨٥٣ لە گرۆت تسوندیرت** -Groont Zundert، **لە ناوچەیەکی سەرووی باربانتی هۆلەندی لەدایکبووە، ڤانکوخ کوری قەشەیەك بووە، لە ڕێگەی خزمەکانیەوە لە بازرگانی کرین و فرۆشتنی کاری هونەریدا لە پاریس و لەندەن کاری کردووە. بەلام دوای شکستی و نابەلەدیەکی ئەشقیکی بیوینە، ڤان کوخ تووشی خەمۆکیەکی قورس دەبیت، لە هەولدانیدا بۆ**

قوتـاربوون لـەو خـەمۆکی و ئەشـقە نائاکامـەی دەچێتـە بـەر خوێندنـی قەشـەیی و زانسـتەکانی ئایین -تیۆلۆژی-، لەمەشدا ناتوانێ بەردەوام بێت و لـە ناوچـە خەلوزیـەکانی بـەلجیکا وەك خوتبەبێژیکی بی بەلگەنامەو نەشارەزا ماوەیەکی کورت بەسەر دەبا، بەڵام لەو کارەشدا سەرکەوتوو نابێت، ئیدی زۆرانبازیە دەروونیەکانی تەنگی پی هەلدەچنن و لە قەیرانیکی دەروونیدا لە زستانی ١٨٨٠ ڤان کوخ پەنا دەباتـە بـەر نیگارکیشـان و هیلکاری، بۆی روون دەبێتەوە کە نیگار کیشـان پیشەی ژیانی لەمەودوای دەبێت.

یەکـەم وانـەی فـێربوونی نیگارکیشـانی لـە بروسـل (بروکسـل- Brussel) لەپاشـدا لـە ئیتـین Etten‌ی مـەنزلگای باوانی، لـە دوایشدا لـە دانهاخ لـەلای ئـەتۆن مـاوڤی Anto Mauve خوێنـدن و فـێربوونی خـۆی دریـژە پیـدا، دوای ئـەم وانـە و فێربووناـنە ڤـانکوخ لای بـاوانی لـەنیونینن (Neunenen) مایـەوەو زنجـیرە تابلۆیـەکی لەمـەر ژیانی جوتیارانی باربانتس Barbants کیشا، ئەو تابلۆیانە کاری زەیتی و ئاوی بوون، لـەم کارانەدا

PDF 4 KURD



ڤانكوخ ژيانی ئەو هەژارانەی نيشاندا كە لە كاری چنيندا كاريان دەكرد، شاكاری هەرە بەناوبانگی ئەو كاتەی، تابلۆيەك بوو لەژێر ناونيشانی - پەتاتە خۆرەكان-، وەكی چۆن ئەو لەژێر كاريگەری ميلی Millet و ئەوانی ديكە لەگەڵ ريالدا كەوتە بەرەنگاريەوە، ئاواش بۆی ئاشكرابوو كە ئەو پيويستە ژيانەوەيەكی نوێ ببەخشيتە ستيلە Stil تاريك و تەماويەكانی، بۆ ئەم مەبەستە لە سالی ١٨٨٦ بەرەو ئەنتڤيرين Antwerpen سەفەری كرد پاشان بەرەو پاريس، لەوێ نەدەتوانرا ئيمپريشينستەكان پشتگوێ بخات، چونكە تيۆی برای ڤانكوخ كە كاتی خۆی وەك وی لە بازرگانی كاری هونەريدا كاسبی دەكرد، دەميك بوو لەگەڵ گروپی ئيمپريشينستەكاندا كاری دەكرد.

لە ١٨٨٧دا ڤانكوخ لەگەڵ تۆلۆز لۆتريك Toulouse Lautree دەستی كرد بە بەكارهينانی ريگەی خالخالی كردن، Pointillismus التنقيطية- كە لە سيوراتەوە Seurat پەرەپيدرابوو[١٢]. هەر لە هەمان ساليشدا بوو ڤان كوخ چەندەها چاپكراوی

PDF 4 KURD



نیگاری یابانی کۆپی کرد، بۆ هیچ نا تەنها بۆ شارەزایی پەیداکردن لەو شێوازە جیگیرەی یابانیەکان رووبەریان پێ چارەسەر دەکرد و کاریان لەسەر دەکرد، لە ١٨٨٨ پاریسی جیهیشت بەرەو ئارلیس Arles، رۆیشت لەوێ لە ئارلیس، لە تەمەنی سی و پینج سالیدا شیوازو ستایلی هونەری خۆی دۆزیەوە: ستیلیکی تایبەت تیایدا رەنگ بە توندرەویەوە خۆی بەسەر رووبەردا بلاودەکردەوە، نوکە قەلەم و هیلکاری شێوەی ئیمزایەکی وەحشیان وەردەگرت، لە ریگەیەوە نیگارکیش ئازارەکانی خۆی پێ دەردەبری.

لەم سورەی ژیانی هونەریدا ڤانکوخ لەگەڵ گۆگان Gauguin کاری کردووە تاوەکو لە دوایدا پیکەوە شەریان بوو و لیك جیابوونەوە. لەژیر پەستانی باریکی دژواری دەروونیدا ڤان کوخ گویچکەی خۆی بری و ماوەیەك لە نەخۆشانەی ئارلیس مایەوە.

لە ١٨٨٩ ڤانکوخ بۆ چارەسەرو پشوودان چوو بۆ سانت ریمێ Sant- Remy، لەوێ

PDF 4 KURD



زنجیرەیەك وینەی تابلۆی دیمەنی سروشتی نیگارکیش کرد، سەرەرای چەندەها کۆپی نیگارکیش کرد کە خۆی بە دلی بوون.

لە ١٨٩٠ بەرەو ئۆڤێر سورئۆیسی Auver- sur- Osie سەفەری کرد، بۆ ئەوەی لای هاوریی دکتۆر پاول گاشێ خۆی چارەسەر کات، لە گەرمەی کارکردندا. تا لیهاتنە دەروونیەکان ژیانی ئەویان پرکردبوو لە گومانکاری، گومانکاریەکی بە توندوتیژییەوە کۆتایی بە ژیانی ئەم نیگارکیشە مەزنە هینا.

ڤینسیت ڤانکوخ بەنیو قوتابخانەی ئیمپریشینستەکاندا تیپەر بوو، تیپەربونیك بوو لە پیناو گەران بە دوای شیوە دەربرینیکی بەهیزدا، کە شیوازە کراوەو خۆشبەختیەکان بکات بە توندوتیژی و جولەی دەربرینیکی کەسی خۆی.

PDF 4 KURD



## ناونیشانی تابلۆکان

**بیرنـارد** Bernard: **هیلکاریـەکی ڤـانکوخ، دوای نیگارکیشی خۆی لە سالی ۱۸۹۱. ئیمیل بیرنـارد** Emile Bernard **شـاعیرو نیگـارکیش و نوســەر، ماوەیـەکی زۆر هاوریـەتی ڤـانکوخ و براکـەی تیـو** Theo **کردووە، لە ۱۸۹۱ دەربـارەی ڤانکوخ کورتـە بیۆگرافیایـەکی نوسـیوەو ڤـانکوخی نیگـارکیش کردووە، لـە هـەمان سـالدا نیگارەکـەی ڤانکوخ و نووسـینەکە لـە کوراسـەیەك بڵاوکرایـەوە، ئـەم**

زنجیره کوراسەیە تایبەت بوو بە نیگارکیشە بەهرەمەندەکان.

ڤانکوخ: درەختیکی سەوزو چرۆ کردو- لە هیرسۆهیگی Hirsohige سالی ١٨٨٨.

تابلۆیەکی زەیتی لەسەر خامی سپی لە چنین و چاپیکی یابانیەوە وەرگیراوە، لەو ساتەدا ڤانکوخ سەرمەستی کارکردن بوو لەسەر ئەو جۆرە هونەرە یابانیە، بۆ ئەوەی لەو شیوازە تیبگات کە لەو جۆرە نیگارکیشیەدا چۆن مامەلەیان لەگەڵ رووبەردا کردووە.

ئیخیگۆسیا هیرۆسیگی ١٧٩٧-١٨٥٨، هونەرمەندی یابانی کە چاپەمەنی و چنینەکانی ئەم تابلۆیەی هەژاندووە، بەناوبانگترین هونەرمەندی شیوازی نیگاری یوکیۆیی e-Ukiyo بووە، ئەم هونەرمەندە توانی لە ژیانیدا زیدە لە ٥٤٠٠ چنین و چاپی رەنگینی نەخشاندووە، لەم ژمارە زۆرەدا هەندیکیان لە ئاستیکی بالآیی هونەریدا بووە، لە ئاستیکی بالآدا بووە لەسەر ئاستی هەموو جیهان.

PDF 4 KURD



ڤانکوخ: پەتاتەخۆرەکان، لەم تابلۆیەدا ستیلە تەمومژاویە سەرەتاییەکانی ڤانکوخ بە روونی دەردەکەویت. ((ڤانکوخ دەربارەی ئەم کارەی خۆی دەلیت: "لەو تابلۆیەدا رەنگم بەکارهیناوە، لە کاتیکدا ژیانی ئەوان بێ رەنگە!". -تەها-))

وەرگیرانی ڤا نکوخ لەئەلەمانیەوە/ ئیسماعیل حەمە ئەمین

## سیورات ١٨٥٩-١٨٩١ Seurat

جۆرج سیورات لە سالی ١٨٥٩دا لە پاریس هاتۆتە دنیاوە، سەرەتاکانی کاری هونەری و نیگارکیشی دەگەریتەوە بۆ سالی ١٨٨٣ ئەودەمەی یەکەمین کاری هونەری خۆی ناردە سالۆن بە مەبەستی نومایشکردنی؛ بریتی بوو لە پۆرتریت و سکیچیکی هاورییەکی خۆی بەناونیشانی ئاماند ژین/ Amand Jean

PDF 4 KURD



یەکەم کاری گرنگ و سەرەکی خۆیشی سالی ١٨٨٤ لە پیشانگای هاوبەشدا بەشداری پیکرد بە ناوی: (Une baignade a Asnieres) لەو کارە هونەرییەدا، سیورات بنەماکانی دیدەنیگاو روانینی خودی خۆی سەبارەت بە سروشت و پەیوەندی و یەکدگیری ئەوەش بە تەکنیکەوەی خستە بەر دیدەی جەماوەرو هونەردۆستانەوە، لە کاریکی هونەری پاشتریشدا بەناونیشانی گراندجات، بە تەواوی بالآدەستی خۆی لە هەموو لایەنیکی هونەرییەوە نیشاندا.. سیورات، لەیەك لایەنەوە و تاکرەهەندی شوینهەلگرو پابەندی ئیمپریشنیستەکانی بەر لە خۆی -بە نزیکەی بیست سالآن- ببوو، کە ئەویش لایەنی تەکنیك بوو، لە ئەزموون و تاقیکردنەوەکانی ئەواندا خولیاو ئارەزوویان لە بەکارهینانی رووناکی و رەنگدا، کاریگەری و ئاکتیڤی ئەوتۆیان بەسەر سیوراتەوە جیهیشتبوو، کە تیکرای ئەوەش بە گشتی لە سکیچ و هیلکاری نیگارە دلفرین و ئالو والآکانیدا رەنگی دەدایەوە، کە بەبێ هیچ گری و گۆلیك پایەیەکی بلندو ناوداریان بە سیورات

دەبەخشی. لە لایەکی دیکەوە، سیورات بەوەش وینا دەکرا کە رۆح و گیانیکی پیرەو ئامیزو سیستماتیکی تیدا بوو، وەلی لە تەرزو جۆری فەرەنسیانە -کە بریتی بوو لە ویست و خواستیکی دەستەبەر و پیویست لە پیناوی میتۆدو بەرنامە دارشتندا، شایانی وتنە؛ کە ئەو هەلومەرجە -میتۆدییەی لە "تیۆرییەکانی رەنگ"ەوە لە فیزیکناسی فەرەنسی شیڤرویل-ەوە سالی ١٨٣٩ وەرگتبوو، ئینجا بەسەر هونەرەکەیدا پیادەی دەکردن.

ئەو شیوازە نوییەو میتۆدی نویخوازییەی سیورات هینانە نیو ریزی ئیمپریشینیزمی نوییەوە، بە رووکەشی و راشکاوی ئەو کۆشش و تیکۆشانەیە، کە بەرەو سیستماتیزەکردنی تەکنیکی روانینگیرەکان و بە تایبەت لە دووا پیشانگای هاوبەشییاندا بەدیار دەکەوت.

و. لە هۆلەندییەوە: حەمەی ئەحمەد رەسوول

## سیناك ١٨٦٣-١٩٣٥ Signac

پاول سیناك سالی ١٨٦٣ لە پاریس هاتۆتە دنیاوە، پیبەپیی ئەو بەروارەش؛ سیناکیش وەکو سیورات و تۆلۆز لۆتریك ئەچیتە خانەی نەوەی نویی ریبازی ئیمپریشینیزمەوە.. سیناك لە سەرەتادا وەك خویندکاریك، بنەماکانی هونەری بیناسازی خویند.. ئەمەش تا ئەودەمە بەردەوام بوو کە ناسیاوی و هاوریبەندی دەگەل

PDF 4 KURD



نیگارکیشـە ئیمپریشنیسـتەکاندا بـووە هۆکـارو فاکتـەریك کـە بریـاریکی مـەتین لای ئـەم هونەرمـەندی دوارۆژە دەسـتەبەر بکـات؛ ئـەویش بریـاری خـۆ تـەرخانکردنی بـوو بـۆ بـواری نیگارکیشی.

لەنیو ئەو کۆمەلە لاوە ئیمپریشینیستانەدا بە تەنها سیناك کەوتبووە ژیر کاریگەری و ئاکتیڤی شیوازو سیستماتیکی کار ریکخستنی سیوراتەوە کـە بریتـی بـوو لـە؛ کـارپیکردنی تیۆرییـەك سـەبارەت بـە لیکدانـەوە و رەنگشـیکاری لـە لایەکـەوەو هـەروەها جیاکـاری و هـارمۆنیکردنی سـەراپاو سـەرجەمی رەنگـەکان لەتـەك یـەکدا لەلایـەکی دیکـەوە.. سـیناك بـە راسـتی خـۆی بـە لایەنگریکی زۆر دلسۆزی سیورات ئەزانی و پاش کۆچکردنیشی کە بە جوانەمەرگی و لـە تەمـەنی سیو دوو سـالیدا سـەری نایـەوە، بـە جیـددی و شیلگیرانە ئەیویسـت ببیتـە جیگـیری سـیورات و سەرۆکایەتی گرووپی نویی ئیمپریشینیزم بکات.. مەبەسـتی گرنگـی سـیناك لەوەشـدا بریتـی بـوو لەوەی؛

PDF 4 KURD



–سەربەستانەو لەخۆوەرا جۆرەکانی رەنگ بەکارهێنان کە پرینسیپیك و مۆدیلیکی باوو بالادەست بوو لای گروپگەری کۆن و پیشینی روانینگیریدا، بەلام بە هەولدانی داهینەرانەی سیناك بچیتە نیو قالبی شیکردنەوەو یەکالاکردنەوەی میتۆدییانەو بە بابەتکردنیان لەگەڵ خالبەندیەکی وردو نەرمی تاکرەنگی (واتە یەکرەنگی تیا بەکاربیت و رەنگی دیکەی تیکەل نەکریت/ وەرگیر..) تیکەلیەکەش تەنها لە کەلین و لیوارەکاندا ئەنجام بدریت، واتە لە پنتی یەکدگیربوونی بابەتە یەکرەنگەکانیشدا لە کاریکی هونەریدا/و.. بەو تیکەلبوونەش لە چاوی بینەردا بریقەوباقی رەنگەکان وەچنگ دەکەوێ و بە ئاسانی بەرجەستە دەبن. سیناك ئەم تیۆرییە نوییەی لە کتیبەکەیدا کە سالی ١٨٨٩دا بلاوی کردەوە بە ناوی "ئۆژینیلا کروا، ئیمپریشیسنیتیکی نوییە". لە دووتویی ئەو کتیبەدا هونەری گروپەکەی خۆی بە کەشتییەك چوواند کە لە رۆخ و کەناری بەهاو نۆرم و ترادیسیۆنی هونەری شیوەکاری فەرەنسی

PDF 4 KURD



سەدەی نۆزدەدا گیرسابیتەوە و لەنگەری گرتبێ. سیناك پاش مردنی سیورات، دەریای سپی ناوەراستی وەك چەقی بابەتیك لیکردو گرنگی زۆری پیدا.. سالی ١٨٩٢ بۆ یەکەم جار لە سانت- ترۆپیز/ Snt. Tropez گەلیك هونەرمەندو نیگارکیشی ناوداری ناسی و لەوانەش ئاشنایەتییەکی توندی لەگەڵ هینری ماتییسدا H. Mattissa بوو، کە بیگومان بەمەش هەگبەو ئەزموونی سیناك دەولەمەندتر دەبێ و روناکی و پزیزکی رەنگە کالەکانی باشووری فەرەنسا/ وەك لای ماتیس و ئەوانیتردا دەبینرا/ و. لە بەکارهینانی رەنگ و ئەزموونی سیناکدا رەنگیان دەدایەوەو پایەو کاریتەی هونەری ئەمیان مەتین و مەحکەمتر دەرەخساند.. ئەوەش بە ئاشکرایی لەو کارە هونەرییانەی سیناکدا وەبەرچاو دەکەون کە دیمەنی دەریاو بەندەرەکانی بە رۆح و گیانیکی زۆر دلفرین و گەرموگورەوە ئافەریدە کردوون..

ئەو تەرزە رەنگانەی لەو کۆمەلە تابلۆو خامانەدا خەملیوون، هەردەم بە نەمریی

PDF 4 KURD



دەمیننەوە، کە بەو پێیەش فاوڤیزم Fauvisme(١٣) هەمیشە لە کارە ئاوییەکانیدا ئامادەگی خۆیان هەیە، فیستڤال و کەرنەڤالی نویی ڕەنگ تیایاندا سەری هەلدا، کە بە بڕوای سیناک ئەوەش تەنها لە کارە بیوینەو ئایدیالییەکانی جیۆکیند/ Jongkindدا دەبینرینەوە..

سیناک، شیوازو ستایلی خودی خۆی هەبوو کە لە میانەی ئیمپریشینیزمەوە سەری هەلداو تەشەنەی کردو تا ساڵی ١٩٣٥ و کۆچکردنی سیناک.. ئەو کاتیش لایەنگرەکانی لەسەر هەمان ریتم و شیواز بەریوە دەچوون و گەشەی زیاتریان پیدا..

و. لە هۆلەندییەوە: حەمەی ئەحمەد ڕەسوول.

PDF 4 KURD



## تۆلووز لۆتریك ۱۸٦٤-۱۹۰۱
Toulouse

هینری ماری رایمۆند دی تۆلووز –لۆتریك– مۆنفا، له ساڵی ۱۸٦٤دا وهك كوره چكۆلهی باوانیكی پیرو به رهگهز له ئاغاو نهجیبزادهكانی فهرهنسا، چاوی بۆ دونیای هونهر ههڵهیناوه، تۆلووز لاوترین نیگاركیشی بوو كاتیك پهیوهندی

لەگـــەڵ گرووپـــی ئیمپریشـــیزمدا بەســـــت، هیـــچ پیشانگایەکیشی بۆ کارەکانی خۆی نەکردنەوە.. تا پلەی ئەندامیتی لە گروپەکەدا وەرنەگرت!!!

تۆلـــووز، خـــولی فـــیربوونی نیگارســـازی لـــە ئاتـەلیری -ستۆدیۆ-ی کارمین دا، وەدەسـتهینا، کە لەو کاتەشدا بە ئاشکرایی کاریگـەری هونـەری (دیگاس)ی بەسەرەوە دیاربوو.. "بە تایبەتی لەو خەسـلەتانەدا، کـە دەگاتـە ئاقـاری بـاوە دۆخـی نیگارگیشـــان، لەوانـــەش؛ کـــارکردنی لـــەپرو لـەناکاودا، هـەروەها لـە تـەکنیکی جوولـەئامیزو یاریکردنی لەسەر یەك هیل..

بـەو ریکەوتـــە سروشـــتییەی کـــە لۆتریـــك بەژنوباڵا چکۆلانەو کورتەبنە بـوو، لەشولاریشـی لـــەوە زیـــاتر گەشـــەی نـــەدەکرد، ئـــەوەش ســـەرچاوەیەکی لیـــل و ژینیکـــی نـــامۆی پـــی بەخشـیبوو، لـە سـەریکی دیکـەوەو هـەر بـەو پیودانگـــەی (هەســـت بـــە کیماســـیکردنە/و.) ببـــووە هـــاندەریك ســـەرنج و تیبینـــی تیـــژ و زۆر تایبـەتی لـەلا گەڵالـە بکـات. گـەر بـەژنوباڵای لۆتریـك بیـهاوتاو بیوینـە بووبـێ لـە سـنوورو

PDF 4 KURD



چوارچێوەی پاریسدا، ئەوا چاوو هێزی روانینیشی هەر بەو شێوەیە بیوینە بوو.. چاوەکانی، وەك دیدەی پشکنەرو راوچییەك؛ هەرچی بکەوتایە بەر دیدەنیگای زۆر بەلەز و بەپەلە، وەك سەرنج و تێبینی دەینووسینەوەو بەراوردی دەکردن (وەك لای خۆمان دەلێن؛ کلی لە چاوان دەفران، بەلام بە مەبەستی بەهرەو ئیلهام وەرگرتن و وەرگیرانیان بۆ تابلۆو کاری هونەری/ و.).

بەشێکی زۆری فیگورو پالەوان و کەسانی نێو تابلۆو کارەکانی لۆتریك؛ لە هونەرمەندانی تیاترۆکان و سەماکەران و نومایشکارانی نێو سیرکەکان و شێوازی گوزەرانیانەوە سەرچاوەیان وەردەگرت و گرنگی تایبەتیان هەبوو لای ئەم نیگارکێشە.. هەر لەو بوارەشدا گەشەسەندنی بە خۆیەوە بینی و مۆرکێکی تایبەتی بە خۆی تیا دەستەبەر کرد. تۆلووز لە بواری ستایل و شێوازە تایبەتەکەی خۆیدا لە گەشەسەندن و بەرەوپێشچووندا بوو، ستایلەکانی وێنەکردنیکی راستەقینە بوون دوور لە نیگارکێشی و

دەستەمۆی خەیال.. هیلکارییەکانی بە جۆش و خرۆش و نەرمونیان بوون (بە واتای؛ کارەکانی زیاتر هیلکاری و سکیچ تیایاندا دەستەبەر بوون/ و.).. کارەکانی بە جۆریکی ئەوتۆ سۆز و وروژینەر وبوون و خاوەنی هیزیکی لەبن نەهاتوو بوون، کە بە هیزە تایبەتییەکەی لۆتریك لە قەلەم دەدریت.. رەنگەکان، بریق و باق و ورشەیان دەهات، بەژن و بالأی کەسەکان -فیگورەکان- ئاوەها لە جموجۆل و چالاکیدا بوون وەك بلیی؛ خلیسکانیی سەر بەفریان دەکرد، بۆ وینە گەر فیگوری کاریکی؛ سەماکەریك بووایە، لە چەند لایەنیکەوە دەیرازاندەوە، لە دیویکەوە چالاکی و کاراکتەرەکەی نیشاندەداو لەشولارەکەی مۆدیلی سەماکەریك بوو، بەلأم سیما و رووخساری یەکیکی دیکەی پیدەبەخشی کە بە پەلەو زۆر بەلەز هەر لەو گوزەرەداو بە بەردەمی تۆلووزدا تیدەپەری (کەواتە وەك دەلین، کلی لە چاوان دەفران) بەو جۆرەو هەر لەسەر ئەو پیودانگە هەموو کارەکانی خۆی بە پۆستەر دەخەملاندن..

PDF 4 KURD



تیکرا ئەمانەی باسمان لیوەکردن، پاساویکن بۆوەی بلیین، ئەم هونەرمەندە نیگارکیشە، بە راستی یەکیکە لە ریبەرانی ئیمپریشینیزم..

زیت و زیرەکی لۆتریك لە بەکارهینانی روانین و خستنەکاری دیدەنیگاکانیدا، مژدەی نەوەیەکی تازەو تیروانینیکی نویی پیبوو، نەك هەر ئەوەندە بەلکو چی دیکە سترانی بۆ نەوەی دیرین و پیشبینی خۆی نەدەچریو.. هەنگاوەکانی لە لیوارەکانی سەدەی بیستەمدا شەقاویان دەداو، هونەری شیوەکاری لە رەوتی روانینگەریدا لەسەردەستی خۆی کۆتایی پیهیناو دەرگای هونەری بە والأیی بەجیهیشت و هەر هیچ نەبێ بۆوەی شەمال و سروەی رەوتیکی دیکەو گروپیکی هونەری نویخوازی دیکەی لیوە بیتە ژووری.

شایانی باسە لۆتریك لە سالی ١٩٠١ لە پاریس و لە تەمەنی سیو حەوت سالیدا بۆ یەکجاریی مالئاوایی لە دونیای هونەر کرد/ ئینسکلۆپیدیای هونەر- ئەمستردام- ١٩٩٤. ل

PDF 4 KURD



٧١٠-٧١١/ وەرگێری بۆ کوردی حەمەی ئەحمەد ڕەسووڵ.

## پەراوێز

١-پیسارۆ لە میانی تابلۆکانیدا ڕەوتی زەوی و خاکی کردبووە بابەتی تایبەتی‌و، هەمیشە لە بەرامبەر مۆنێدا کە خولیای ئاسۆی فراوان و ئاسمانی هەبوو دەوەستایەوەو پێکەوە گروپەکەیان دەوڵەمەندتر کردبوو، لەوەشدا مۆنێ لە ولیەم تێرنەر دەچوو و

هەرچی پیسارۆیە کۆنستابلی وەبیر مرۆ دەهینایەوە. (تەها)

٢-گۆستاف کۆربێ/ ١٨١٩-١٨٧٧/ نیگارکیشی ناوداری فەرەنسی، بە باوکی ریالیزمی هونەری شیوەکاری دادەنرێ، کارە هونەرییەکانی رەنگی تۆخیان تیا بەکارهاتوون.. فیگورەکان، بەهیزو توندو پتەو بوون.. ستیل لایف و پۆرتریت و دەشتودەرو لەشی رووتی ژن، لە هەرە کارو جۆری بابەتەکانیتی. ((ئینسکلۆپیدیای هونەر-ئەمستردام/ ١٩٩٤ ل ١٥٥/ و.)).

٣-ئینسکلۆپیدیای هونەر- ئەمستردام/ ١٩٨٤ ل ٦٥٤/ و. حەمەی ئەحمەد رەسول.

٤-سەرباری ئەوەی دیگاس لە خولیای ئەوەدا بوو ببیتە نیگارکیشی کلاسی سەردەمەکەی خۆی، بەلام ژیانی هاودەم بەهیزتر رایدەکیشایەوە هەناوی خۆی، ئەم جۆرە هەستەی (لە نیوان دوالیزمی کلاسی و ژیانی هاودەمدا) سەردەمانیک بەسەریەوە زال بوو و هەر بۆیە -لە سەرەتادا- هیرشی توندی دەکردە سەر ئیمپریشینزمەکان و گالتەی پیدەکردن وەختیك لەژیر تیشکی خۆردا راستەوخۆ کاریان دەکرد، بەلام دواجار بە ستایلی خۆیەوە

PDF 4 KURD



ڕەوتەکەی دەولەمەند کردو بەردەوام بوو تا کۆتایی ژیانی. (تەها)

٥-سیسلی سالآنیکی زۆر بەرهەمەکانی ڕەواجی ئەوتۆیان نەبوو و نەدەفرۆشران، لەژێر کاریگەری و ڕینماییەکانی مۆنێ و پیسارۆدا وردە وردە ڕەنگەکانی ڕوو لە گەشی و ئالی دەکشان و دەروازەی ناوبانگی لیکرایەوە. (تەها)

٦-کوبیزم؛ کوبیزم یان -Cubismo/ بەرامبەری - الاتکعیبیە-ی عەرەبی، ڕەگی زاراوەکە دەگەڕیتەوە بۆ وشەی لاتینی کۆن کە مانای شەش پالو دەگەیەنێ.. وەك ڕیبازو بزووتنەوەی هونەری لەسەر دەستی پیکاسۆو براك و سالی ١٩٠٧-١٩١٤ لەوپەری برەویدابوو.. /ئینسکلۆپیدیای هونەر- ئەمستردام/ ١٩٩٤ ل ٣٩٨ - وەرگیری بۆ کوردی-حەمەی ئەحمەد ڕەسووڵ.

٧-مۆنێ زیاد لە هەموو سەرنجخوازەکان/ ئیمپریشینیزمەکان بەگورتر بوو و تا دوا هەناسەو چرکەی ژیانی لەسەر ڕەوتەکەی خۆی مایەوە، دوا کارەکانی زنجیرە تابلۆیەکی قەبارە گەورە بوون لەسەر قەوزەو گولە ئاوییەکان و ئیستا پیکەوە لە مۆزەیەکی مۆنیدا کۆکراونەتەوە. (تەها)

PDF 4 KURD



٨ –مەبەست لە تابلۆی لیزاو چەترەکەیەتی. (تەها)

٩–پاش گەشتیکی بۆ ئیتالیا گەیشتە ئەو ئاکامە، وەختیك چاوی بە شاکاری هونەرمەندان کەوت، لەم بارەیەوە رینوار دەلیت: "گەیشتمە ترۆپکی ئیمپریشینیزم و بەلاّم هیشتا نەگەیومەتە نیگارکیشان!". (تەها)

١٠–لەگەڵ مۆنێدا چەندین جار پیکەوەو لەپال یەکتردا هەمان دیمەنی سروشتی پیش چاویان کیشاوەو لەویدا تایبەتمەندیی هەریەکەیان بەیان دەبیت. (تەها)

١١–لە کۆلیتەکەی خۆیدا بە کوژراوی دۆزییانەوەو شایانی وتنە ئەو دوورگانە لەلایەن فەرەنسیەکانەوە پیشتر داگیرکرابوون. (تەها)

١٢–تیۆی برای پیدەچوو زیاتر پیسارۆی هەلبژاردبیت لە گروپی ئیمپریشیۆنیستەکاندا، هەر بۆیە کاریگەری پیسارۆ بەسەر کارەکانی ڤان کوخدا دیاری دەدا، لە شیوازە خالخالیکردنەکەی سیوراتیشدا پیسارۆ یەکەم هونەرمەند بوو لەگەڵ ئیمپریشیۆنیستە نوییەکاندا پەیرەوی کرد. (تەها)

١٣–فاوڤیزم/ Fauvisme:

فاوڤیزم یان فۆڤیزم– افوقیە یان وحوشیە (بە عەرەبی) رەوت و ریبازیکی هونەرییە لە مندالدانی –

ئیسپیریسیۆنیزم (التعبیریه/ دەربرینخوازی)یەوە لە سەرەتای سەدەی بیستەم سەریهەلدا و لەسەر دەستی ماتیسدا بە تەواوی بووژایەوە، نیگارکیشی هاندەدا بۆ هینانە کایەی بەرهەم و کاری هونەری نوێ دوور لە گشت کۆت و زنجیریکی لاساییکردنەوە، بەوپەری سەربەستی و سەربەخۆیانە هەست و سۆزی توندوتیژو تا رادەیەك رەق لە میانەی فۆرم و رەنگە تۆخ و زەقەکانەوە دەردەبرن.. رەگی زاراوەو چەمکەکە لە وشەی Fauvesی فەرەنسییەوە هاتووە کە مانای گیانداری درندە دەبەخشێ، بە هونەرمەندان و نیگارکیشانی ئەم ریبازە دەووترێ "فوڤێ یان فۆڤیست" ئینسکلۆپیدیای هونەر– ئەمستردام/ ١٩٩٤ ل ٢٢٧ / و. حەمەی ئەحمەد رەسوول. (لە هونەرمەندە ناودارەکانی ئەم رەوتە: دۆفی، مۆریس ڤلامینیك، دیرین، ماتیس، سیناك، پۆل گۆگان.. تاد؛ جگە لە کاریگەری رەوتی خالخالیکردن، سەرچاوەی ئەم ریبازە بۆ ئیمپریشیۆنیستە نوییەکانی وەك سیزان، ڤان کوخ و گۆگان دەگەریتەوە، ئەگەر ڤانکوخ ستایلی بەش بەشی و پچر پچری پەیرەو دەکرد، ئەوا گۆگان شیوازی تایبەتی خۆی گەلیك لەم رەوتە نزیك بوو، سەربەستی رەنگ و رەنگ لە پیناوی رەنگ خۆیدا سیمای ئەم رەوتە نوییە بوو کە ئیدی لە پاشاندا

هونەرمـەندانى روتـەنى- ئەپسـتراكت سروشـيان لى وەرگرت -تەها-).

ئينسكلۆپيدياى هونەر- ئەمستردام/ ١٩٩٤ ل ٢٢٧/

وەرگيرى بۆ كوردى: حەمەى ئەحمەد رەسوول.

PDF 4 KURD